نیگار نادر



# ها ئەتو سەرپشک بە



# That Would Be Preferable

من قەت دەست نادەمە قەڵەم
هەتاوەکو بیرم تەنگەتاوم نەکات و
خەیالم وەکو شەمامە نەڕەنگێ

Auther
Negar Nadir

2014

ناوی کتێب: ها ئەتو سەرپشك بە

نووسەر: نیگار نادر

تایپ: سەید ئارام

دیزاینی بەرگو  ناوەرۆك: سەید ئارام

تیراژ: (٥٠٠) دانە

چاپخانە

ژمارەی سپاردن لە بەڕێزەبرایەتی گشتیی کتێبخانەکان (    ) ساڵی ٢٠١٤ی دراوەتێ

هەولێر ٢٠١٤

# سەردەمی سەرپشك بوون

سەرپشك بوون بە مانای ئەوە دێت کاتێك مرۆڤ دەکەوێتە بارێك، کە مافی پێدەدرێ لە نێوان چەند شمەکێك یا چەند بیرۆکەیەکدا یەکیان هەڵبژێرێ بە پێی حەزو پێداویستیو خواستی خۆی. روونتر بڵێم ئەو جۆرە هەڵبژاردنە زۆر جاران لە خۆشەویستیو متمانە پێکردنی کەسی بەرامبەر ڕوودەدا، یان وارێدەکەوێ کە مرۆڤ بۆ شتێك یا بابەتێك سەرپشك دەکرێت، کە کۆمەڵە داواکارییەکی لەسەرەو ئەو شمەکە زۆر بە برەوە.

ئەورۆ حەوجە بەوەدەکا کە ورد ورد ڕامێنین لە چواردەورو ڕێڕەوەی خۆمان کە بە سەرەمێکدا ڕێ دەکەین کە جێی خۆیەتی ناوزەدی بکەین بە سەردەمی سەرپشك بوونو هەتا ڕوونتر بناغەی جیهانی نوێ ببینین ئەو تۆڕە نوێیەی تەکنۆلۆژیا ببینین کە چۆن بە وردی بەدەوری زەویدا هەڵچنراوەو ڕەگی دەرهاویشتۆتە ناو هەموو دەوڵەتانو بە ناو هەموو کولتوورەکان وەربووە، تاکی هەموو کۆمەڵگەیەکانی سەرپشك کردوە لە

هەر جۆرە شمەکێك کە خواستو تەمەنای دەکەن لە چۆنیەتیو چەندیەتی.

لەسەردەمی سەرپشك بووندا رۆژێ لەسەدان کایەی جوداجودا بەشێوازی تێژڕەو هەر لە فیکر ڕا هەتا سەرسوڕهێنەرو ئاسانترین کالاّ لە کێبەڕکێو خۆڕانان دان، بە تەنها بەرامبەر مرۆڤو قولاپ گیرکردن لە حەزو چێژو خەونەکانی، عەجەبا دەبێت مرۆڤ لەو سەردەمەدا چ هێزێکی پێویست بێت کە بەرامبەر ئەو شەپۆلو بەرە بێ ئەژمارەی تەکنۆلۆژیا بەرەنگاری بکا؟!..

مرۆڤ لەو سەردەمەدا کەوتۆتە ناو زەریایەك لە ڕیکلامو تەوقدراوە بە گێژەڵوکەی میدیا، لە بەرهەندێ لەناو هەر کولتورێکدا وەکو تاك خۆ لەسەریەك ڕۆنان وەکو تاکێکی هۆشیارو خۆپارێز بۆتە کارێکی بڕەك زەحمەتو حەتمی . بەو مانەیەی ئەگەر لە ئاستێکی دیاریکراوی هۆشیاریدا نەبێت ئەوا دەکەوێتە بەر بەرداشی میدیاو تەنها ژێدەرت دەبێتە ئەو میدیا پێکهێنراوەی هەموو جیهانی هەڵچنیوە بەو ڕەنگو بەو دەنگانەی بۆخۆی گەرەکیەتی. بۆیە سەرپشك بوون لەوەی چ میدیایەك هەڵدەبژێری دەبێتە هۆو ڕەنگڕێژکردنی کەسایەتی تۆی مرۆڤ وەکو مرۆڤێکی هۆشیارو دانسقە لەناو ئەو گێژەڵوکەی میدیا جیهانییەو تەواوی ڕایەڵەکانی فیکرو مەعریفەدا.

دەكرێ لەو سەردەمی سەرپشك ڕامێنن وەكو سەردەمێكی دژەگەرەنتی زامن بوون، چونكە لەو سەردەمەدا مرۆڤ ناتوانێ هەتا گرەنتی مانـەوەی زانستیترین لێكۆڵینەوەوی ئەكادیمیو فیكریو داهێنان لە هەر بوارێكدا بكا، چونكە ڕێی تێدەچێ پاش ساڵێك لقێكی نـوێتر یـا بێتـە نـاو ئـەو زانستە، فیكرە، یان لە ڕێی تەكەنۆلۆژیاوە موتوربە بكرێتە سەری ، بـە دیوێكی دیدا تاك سەرپشك كراوە لەوەی چ ئایدۆلۆژیایەك چ كولتوورێك چ ئاینێك یا چ زانیاریەك هەڵدەبژێرێ، بە پێچەوانەش هەر هـیچ لەوانـە هاڵنابـژێرێ ، شـەپۆلی سەرپشـك بـوون بوومەلەرزەیـەكی گـەورەی خوڵقاندوە لەناو هەموو كایە فیكریو ئایـدۆلۆژیو زانسـتییەكاندا، بـۆ نموونە Skype یەكە لە بێ سنووری سەرپشكێتی ئەگەر سەرنج بدەی ئـەو بەرنامە دەكەیەوە لە كورترین كاتی زەمەنیدا كێو لەهەركوێیەك بێـت كە دەتەوێ بە ڕەنـگو دەنگـی دەگـەی. یـا وێنەیـەك لـەناو تەلەفۆنـە مۆبێلەكەت دەگری دەستبەجێ بۆ ئازیزێكی لەوسـەری دنیایـە دەنێـری، بەلاّم مرۆڤ سەرپشكە بۆ كێی دەنێرێ یا چ شتێك یا وێنەك دەنێرێ، چۆن مرۆڤ سەرپشكە لەوەی ئەوڕۆ چ خواردنی چ جۆرە نەتەوەیەك هەڵدەبژێرێ یان كـالا لـە چ كۆمپانیایـەك دەكـڕێ یـا جلكوبـەرگی چ ماركەیـەك دەپۆشێ.

وەختێك لەسەردەمی سەرپشـك بوونـدا كولتـووری سەرپشـك بـوون هەڵدەتۆقێ بەتایبەت لەناو نەتەوە فەرهـەنگ ڕیوەڵـەو لاوازەكانـدا زۆر

هاوكێشەو پرەنسیپی مرۆڤایەتی لاسەنگو سەراوژێر هەڵدەگەڕێنەوە، چونكە تاكی سەر بەو فەرهەنگانە زۆر بە دەگمەن جیهانبینی خۆڕسكی خۆی پاراستووە، بۆیە گرنگی نادات بە پاراستنی ڕەسەنایەتیو كەمتەرخەمیشە لە هەڵبژاردنی نوێگەریو بەناوی سەرپشكایەتیەوە جۆرەها بەها بە هەدەر دەدات.

سەرنجی چڕتر لەبۆ نەتەوە فەرهەنگ هەلاهەلابووەكان سەرپشك بوون دەبێتە كولتوورو چۆن ئاستی مەعریفیان لە كزی داو بەو پێوەرە خوارتر دادەكشێ، ئەوەی دەبێتە ئامانج تەنها گەیشتن بە ڕووە بریقەدارەكانی ژیانەو سەرپشك بوون دەبێتە هۆی تێكشكاندنێكی بێسنووری حەزو چێژو ڕەسەنایەتی. بۆیە هەمووتان سەرپشكن كە ئەو كورتە بیرۆكانە دەخوێننەوە یان نا.

## ئەحلام مەنسوور
## بەرسڤی هەموو پرسە کپکراوەکانی نووسەری ژن

ئەز ئەگەر بەدڵ دڵنیا نەبم کەسێك تەواو راستگۆو رۆشنبیرو شۆڕشگێڕە، قەت قەڵەمەکەم نابزێوم تا ژیانی بنرخێنم، ئەزو شیعر نە وێك هەڵدەکەین نە پێکهەڵدەکەین، هەموو دەمێ شەڕمانە داخوا کێهەمان لە کێهەمان سەرکێشترین یاخیترین سەرەڕۆترین بێسنورترین بێ پێناسترین بێ جڵەوترین بێ ناونیشانترین، هەروەها بەخۆو بە شیعریش هەردەم دەخولێینەوە، تا باڵ لەسەر شیعرێکی جوان بخەین، سەر لەبۆ رۆشنبیرێکی نەدۆڕاو دانەوێین‌و ژیانی ژنێکی سەرکێش‌و شۆڕشگێڕێکی راستەقینەو رۆشنبیرێکی پاك بنرخێنین.

ئەدەبی کوردی ئەو ئەدەبە پەنگخواردوو قەتیسماوەی، تاقە خوێنەرێکی لەدەرەوەی خۆی نییەو لەخاکەکەی پەرتەوازەترو لێکهەلوەشاوەترو بێشوناسترە، سەرەڕای ئەوەی لەوەتەی هەیە لەدووسێ ژانری دیاریکراو، کە دیارتریان شیعرە، پەلوپۆی تەواوی لەبۆ هیچ لەژانرەکانی دی ڕانەهاویشتووەو، لەسەریەك تولەڕێ هەڵکشاوەو وەرچەرخانی تێدا روونەداوە. رۆشنبیرە رەسەن‌و راستگۆیەکانیشی هەردەم

خزێنراونەتــــە خانـــەی پـــەراوێزیکردن و بێبـــەهاکردنی بەرهـــەم و، تەقەڵاوکەسایەتییان لەژێر هێرشی ناوو ناتۆرەو بوختاندا بووە.

لێرەدا بە ئەرکی دەزانم و کەیفم لێیە لاپەڕە لەسەر ژیانی رۆشنبیرێکی ژن هەڵدەمەوە، کە ئەو ئەدەبە بەبازرگانی بووەو ئەوکۆمەڵگە بەدەڵ بووە هەنگاوی بۆ داوێژێ و دەیەوێ پەراوێزی بخا، ئەگـەر لـە ئازایـەتی خـۆی نەبا، تا ئێستا کەس ناویشی لەیاد نەدەماو نوزەی لەبەردەبڕا! هەرچەندە نڤیسینی وتارێك بەس نییە بۆ نرخاندنی ئەو رۆشنبیرە، لێ هێڤی دەکـەم لە ئایندەیەکی نزیکدا بتوانم بەکتێبێکی شایستە بینرخێنم.

ئەز دەمەکە بـێ هیـوام لـە بـوونی ژنـی خۆبەختکـەر، لەهەریـەك لەکایەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا، بەتایبەت لەنێو کایـەی رۆشـنبیریدا، لێ هیچ کاتێك ئەحلامم لە زەین ناچێتەدەرو لـە پـێش چـاوان لاناچـێ، هەمیشە لەگەڵ وەبیرهاتنەوەی هەر قوربانییەك، کوشـتنی هـەر ژنـەك، دڵشکاندن و تەرکە وەتەن کردنی هەر ئەدیبێك، بێ نرخکردنی بەرهـەم و ژیانی هەر رۆشنبیرێك، ئەو ژنە رۆشـنبیرە زەیـنم دادەپۆشـتەوە، ئێسـتێ لەهەر ناوەندەك بڕوانی بەخێزەرە ژنـی بـەدەڵ بـەناوی نووسـەرو شـاعیر، بەناوی مافخوازو رۆشنبیر دادەبارن و، لێ بەدەگمەن نەبێ ژنێك نابینیەوە ژیانی تایبـەتی خـۆی بـەخت کردبـێ لەسـەر ئـەوەی بـڕوای پێیـەتی، بەتایبەت ژیان بەختکردن لە پێناوی پاراستنی قەڵەمەکەی.

ئەحلام ئەو ژنە عاشقەی، لەسەردەمەکی زۆر تەسکدا بۆ دەرکـەوتنی ژن و بیستنی هەناسەی ژن، عاشقانە دەسـتی داوەتـە نووسـین و چـەندین سەنگەری بەرامبەر ڕۆنراون، ئەز نازانم ئەگەر ژنێك عاشـق نـەبێ چـۆن

دەبێتە ژنێکی راستگۆو رۆشنبیر؟ چۆن دەتوانی لە بوارەکەی خۆدا پێهەڵێنی؟ ئەگەر ژنێك یاخی نەبێت چۆن دەبێتە ژنێکی نووسەر؟ ئەگەر ژنێك چاوی لەوەبێ هەموو خەڵك بەچاوی ئاسایی تێی بڕوانن‌و ببێتە جێ ستایشی پیاوان، چۆن دەبیتە ژنێکی رۆشنبیر؟ نازنم چۆن ژنێکی نووسەر ئەگەر بەتەمای ئەوە بێت خودان مێردو ماڵێکی ئاسایی بێت، چەوا دەتوانێ بە خۆبێژی خۆم لەقەرەی جەسارەت دەدەم؟ ئەگەر هەر ژنێك بەهەویای ئەو مەدالیایە شەرەفە بێت پیاوانی نووسەر پێی دەبەخشن، دەبێ هەتا هەتایێ دەست بەکلاوی خۆوەبگرێ، تا با نەیبات‌و لەلارا جار جار هەندێك بابەت‌و شیعری بەدەڵ بوەشێنێ‌و خۆ لە قوژبنەکانی رۆشنبیری پەستێوێ.

ئەز لەبۆ هەموو ئەوان پرسان ئەحلام مەنسوور دەکەمەوە بەرسڤ، چونکە ئەحلام زۆر دەمێکە کەسایەتی پێگەیشتوە، هەردەم چۆکی دانەداوە تا سواڵ لەبەر سیاسیان بکاو دەسڕۆکە لەبەردەستی نووسەران ڕاخاو گوڵ بەبەرتیل بەرێتە ریکخراوەکانی ژنان‌و قەڵەم بە ژنکوژان بەکرێ بداودەرۆژە لەبەر رۆشنبیران بکا، تا ناوی بخەنە ناوو ناوان‌و سەرزاران‌و بەناو رەخنەیەکی لەسەر بنڤیسن‌و لە سوچی گۆڤارێك یا پشتی رۆژنامەیەك بەرهەمێکی رانێنن، بەسەد تکاورجا کۆڕێکی بۆ ڕیکبخەن‌و بەرگی سور بپۆشێ لە پێشڤازی سەرکردەکان، هەروەها قەت عەوداڵ نەبووە بەدووی رۆژنامەنووساندا، تا هەواڵ‌و وێنەکانی وەکو مانشێت دابەزن‌و سەر لەودائیرەی نووسەران هەڵێنی، تا وەبەر پاداشتێك یا خەڵاتێکی بدەن.

دیاره هەموو ئەحلام مەنسوور دەناسن، ئەحلام سی ساڵ لێرەوپێش داوای بەرانبەری ژن‌و پیاوی کردوە بەبێ ترس، هەموو بێزەوەرییەکانی کۆمەڵگەی دانپێداناون، بێ کشانەوە باجی هەموو وشەکانی خۆی داون، ئەحلام ژنێك نییە لە ئازادییەکانی ئەوروپا هەندێك بابەتی سادەی دەرخ کردبێ‌و، کە گەڕایەوە کوردستان قۆڵۆباسکی هەڵماڵێ، خۆبرەنگێنێ‌و لە دائیرەکانی حیزب‌و حکومەت بەدوی ناوبانگ‌و کۆڕو کورسی دەسەڵاتدا عەودالْ بێت، یا پاسەوانی تایبەتی بۆ تەرخان بکرێت! ئەحلام لەرێی ماندوبوون‌و خوێندنەوەی خۆی زۆر قۆناخی تێپەڕاندون، کە زۆر ئەستەمە ژنان پاش دە ساڵی تریش بگەنە ئەو جەسارەت‌و بڕیارانە، ئەو بەبێ هیچ پاڵپشتێك بەرووی هەموو کۆمەڵگەو ئەو پیاوسالاریەو ئەو ئەدەبە پیاوسالاریەدا هەلچەرخاوەتەوەو چۆکی دانەداوەو نەکشاوەتەوە.

نازانم مانای رۆشنبیر چیە، ئەگەر یاخی نەبێ؟دەپرسم دەبێ لە پانتای ئەدەبی کوردیدا چەند ژنی رۆشنبیرو یاخی هەبێ؟ ئەگەر ژنێك هەڵنەکەوێ بەرهەمی قەدەخە بکرێ بە مانای چ دێت؟

ژنی نووسەر زۆرن، لێ ئەو ژنانەی خودان قەڵەمی خۆن‌و راستگۆن زۆر دەگمەنن. زۆر ڕوونە لەکۆمەڵگەی مەدا بەپێچەوانەی هەموو هاوکێشەکان، ئەگەر راستگۆبیت وەها پەراوێزدەکرێ‌و گڵ وەسەردەدەرێی، زۆر بەزەحمەت رۆژنامەنووسێك یا نووسەرێك بە خەیاڵیدا دێت، کە تۆ ماوی‌و نەخواستە تیڤیەك بتهێنێتە پێش چاوان‌و یا بانگهێشتی بۆنەو سیمینارێك دەکرێی‌و یا بەشاند دەنێردرێیە ولاتانی دەرێ.. هتد.

ئەمن پێم وایە نووسەر ئەگەر راستگۆو بە ویژدان نەبێ، هەوڵ شت بەرامبەر ژیانی خۆی ئەوا بەرهەمیشی بێ نرخەو ئەوەناهێنی چاوی خۆتی پێوە هیلاك بکەی، ئەحلام بەتەنها ژنێکی جەسوور نییە، بەڵکو ئەدیبێکی جەسووریشە، ئەوە جیاوازی زۆرە مرۆ بتوانێ هاوسەنگی نێوان جەسارەتی ژن بوونو جەسارەتی ئەدیب بوونی رابگری، چونکە لەناو ئێمەدا زۆرجاران دەبینی ژنە ئەدیبێ واهەیە، لەشیعرێکدا دەجار باسی ماچو نازانم رووتبونەوەو دلداریو چو چ دەکا، لێ ئەگەر دێتە سەر واقیعو پرسیاری لێدەکرێ، بەکاراکتەرێکی زۆر دەستەمۆ خۆ پیشان دەداو هەرخۆ لەو ئاقارانە نادات، یارییەکی دووبەرەکی گەمژانە دەکا، دەیەوێ بە ئەدیبێکی پێشەنگو داهێنەر خۆ نمایش کا، لەهەمانکاتیشدا بەژنێکی ماقوولی ناو کۆمەڵگە، ژنێکی هەڵکەوتەی ناو بازاڕی سیاسی، ژنێکی خودان گەلێك ماف، ژنێکی بەرچاوو رەنگکراو بۆ پیاوان.. هتد. لەبۆیە هەتا ئەو دووڕوییو دووفاقیە هەبێ، دەنگی ژن لەئەدەبدا لەوە پتر کپ دەبێو دەپوکێتەوە.

بەو مانایەی دەکرێ ئەو هەموو ئازادیانەی ئەحلام مەنسوور باسیان دەکا، ژنان پلانیان هەبێو خەونی پێوە ببینن، لێ هیچ کاتێك ئامادەنین بەڕاشکاوانە لێی بدوێنو پێی لەسەر رابگرنو بانگەشەی بۆ بکەن، بەپێچەوانەوە دێن لە جۆرەها هاوکێشەو جرۆجانەوەری وەردەپێچن!

ئەحلام ئەو ژنە عاشقەی بەو هەموو برینانەوە، نە رۆژێك ئامادەبووە پاشگەزبێتەوە لەعەشق نە رۆژێك سەنگەرەکانی راستگۆیی چۆڵ کردون، چونکە ئێستێ ئەگەر بەوردی دیقەت بدەین، رۆژێ بە خێزەرە ژن لەسەر

عەشق دەنووسن‌و باس لە رووتبونەوە دەکەن لە بەناو شیعرو چیرۆکەکانیاندا، لێ چونکە بەراستی نە دڵدارن نە عاشقن، ناتوانن لەسەرنجێکی بازاڕی پتر سەرنجێکی دی بەبنەما بۆخۆیان وەدەست بێن!
لەبۆیە من پێم وایە ئەگەر ژنێك بەڕاستی عاشق بێت‌و بەراستگۆیی خۆشەویستی بکا، دەبێ هەمیشە ئامادەبێ خوێنی بڕێژرێ، هەمیشە سەنگەرەکانی خۆی پتەو بکا، بەتایبەت ژنی ئەدیب ئەرکیەتی عاشق بێت‌و ئەرکیەتی جاڕی گۆڕانکاری بدا، بەو مانایەی سەنگەرەکانی ژنی نووسەر پێویستە تۆکمەتر ڕۆنرێن‌و، نە بەکەس‌و نەبە هیچ نەڕوخێن.
ئەوجار ژن رێچکەیەك لەئەدەبدا وەبەر دەنگی خۆهەڵدەبڕێ، لێرەڕا دیسان دەمەوێ بپرسم تاکە نووسەرێکی ژن هەیە بەراستی دانی بەچەندجار عاشقبوونی خۆیدا دەنێ‌و دانابێ؟ چ نووسەرێکی ژن ئامادەیە هەموو نامەکانی خۆی بلاوکاتەوە؟ کێهە نووسەرە لەسەر خۆشەویستێکی خۆی نووسیوە؟
چ ژنێك جەسارەت دەکا هەموو باوەکان ڕەتکاتەوە؟ چ نووسەرێکی ژن ململانێی خۆو ئەو پیاوانەی ئاشکرا کردوە کە لەسەر خۆشەویستییە؟ چ نووسەرێکی ژن دانی بەناوی ئەو پیاوانە داناوە، کە بەناوی دڵداری‌و عەشقەوە قۆڵیان بڕیوەو برینداریان کردوە؟ چ رۆشنبیرێکی ژن شکایەت لەو هۆقەبازانەدەکا، پاش ئەوەی لێی وەڕەس بوون فڕێیان داوەو کار بۆ پەراوێزبوونی دەکەن؟
دووبارە ئەحلام بەوبەرسقە ئازاو چاونەترسە دەهێنمەوە کە هەرگیز خۆی نەکردۆتە قاسەیەك پڕبێ لەپیاوی فرتوفێڵباز، قەت قفلێکی لەدڵی

نەداوە تا پیاوە ساختەچییەکان بـزربن‌و هـەرگیز چـارۆکەیەکی بەسـەر هەموو ئەو نەهامەتیانە دانەداوە، کە لەسەر عاشقبوون‌و خۆشەویسـتی ئێخەیان پێگرتوە، تا ئێسـتاش بـەدێرێك بـە نووسـینێك کلکەسـووتەو زمانەسـووتەی لەبـەر هـیچ سیاسـی‌و بەرپرسـێك نـەکردوە تـا بـەخێر پۆستێکی بدەنێ‌و خۆ بکاتە رێکلامی ئازادی‌و ماف‌و چالاککەری ژنان‌و قەتیش جۆلانەی بە هەڵوێستی خۆ نەکردوە بۆ وەدەستهێنانی ئەو حیزب‌و ئەو حیزب! هـەموو ئـەڤ هەڵوێسـتانەی ئـەڤ ژنـە نووسـەرە خودانیانـە هەڵوێسـتی مـرۆی راسـتگۆو پـاك‌و رۆشـنبیرن لـێ لـەو سـەردەمە بەربووکیەی ژیانی رۆشنبیری کورددا ژێرگلدەکرێن‌و کەسێك ئامادە نییە هەر بە وتارێك ژیانی مرۆیەکی خۆبەختکەر بنرخێنێ، بەڵکو تـا بۆیـان بکرێ قسەی پڕوپووچ دەهۆنەوەو ئەو کەسە تووشی دڵشکانێ دەکەن لـە هەموو کایەکی ژیان‌و هەموو رەنج بەرهەمی پشت گوێ دەخەن.

مـن لەبۆیـە هەمیشـە ژیـانی ئـەحلام دەنـرخێنم، چـونکە دڵنیـام بەدەسـتەکانی خـۆی بـەبێ پشـتگیری پیـاوان توانیویـەتی بـەردەکانی سەنگەری خۆی لەسەریەك ڕۆنێ‌و باجی جوانی‌و تەمەنی خۆیـان بۆبـدا، هەروەها دڵنیام مانەوە لەو سەنگەرە بۆ ژنێکی ئـەدیب چ دژوارەو چ پـڕ دەردەسەرییە لە کۆمەڵگەیەکی ئەوهاداو بەتایبەت ئەودەمەی دڵسۆزێك نەبێ لەپشتت ڕاوەستێ بەدڵ دڵنەوایەت بکا، چونکە هێرشەکان بەتەنێ لەلایەن کۆمەڵگەو دابونەریتی داواکەوتووەوە نین، بـەڵکو هێرشـی هـەرە درندانـەو رووخێنـەر لەئـەدیبان خۆیانـەوە بـەرەو ڕووت دێـن.. پلانـی تێکشکاندنت دەدەن هەرلە ناوو نـاتۆرە ڕا بگـرا تـا قسـەی پڕوپووچـی

لەبابەت خەونە نەخۆشەكانی پیاوان! لەو دەمەیدا ئەگەر هەر دیوێكی ژیانی خۆیان بپشكنی تژیە لە قولاپ بۆ پێوەبوونی هەر مێیەنەیەك!

ئەوەی لە كەسایەتی ئەحلامدا سەرنجی پەلكێش كردوم ئاگاییە، ئەڤ ژنە ئاگاییەكی قووڵی خۆڕسكانەی هەیە جگە لەئەدەب لەبۆ هەموو گۆڕانكارییە ئابووریو سیاسیەكانی ناوخۆو دەوروبەرو دنیا هەمیشە بە بەردەوامی گوێ بۆ دەنگوباسە جیهانییەكان رادەدێرێ، پاشانیش سەرنجێكی پوختو جوانی لەسەری دەدا. لەودەمەیدا هەست دەكەی زۆر ئەدیبی دی ئەسڵەن ئەو ئاگاییەیان نییە، ئەگەر هەشیانبێ ئەوا خۆڕسك نیە لە كەسایەتیاندا، ئەو بابەتەی مەبەستیان نەبێ یا لەبەرژەوەندییان نەبێ ئەوا هەر بای دێ لەلایان، هەروەها ئەگەر ورد لەبەرهەمەكانی ئەحلام فكرین جگە لەو جەسارەتەی لەبەرهەمە ئەدەبییەكانیدا رەگی داكوتاوە لە وتارەكانیشیدا فرەڕەنگیەكی سیاسی دەبینیەوە، كە چەند نەتەوەییانە لەخەمی خاكو نەتەوەی خۆیەتی، چۆن بە راوسەرنجە پوختەكانی ئامانجەكانی دەپێكێ، هەروەها چۆنیەتی بەرگپۆشینو هەتا دانیشتنی تایبەتمەندییەكی خۆی پێوە دیارەو سەربەخۆیانە بە باوەڕ بەخۆبوونەوە دادەنیشێو هیچ نمایشێكی لەدەرەوەی كەسایەتی خۆی كۆپی نەكردوەو سادە لەخەمەكانی خۆی دەدوێو قووڵ قاقایەكان بۆ ژیان دەكیشێ، هەروەها چۆنیەتی ژیانی، ئەو ئێستا بەتەنیا دەژی كە بەتەنیا ژیان سەرچاوەكی قووڵی باوەڕبەخۆبوونە، سەرەڕای دەردەسەرییەكانی خۆ بە ژنێكی ئاسنین وەبەرچاوان نادا وەكی ئەو ژنە نووسەرانەی بەقسە دنیایان هەڵبڕیوەو بە هەڵسوكەوتیش

ناتوانن ئێرەو هۆوەی بڕۆن بەتەنیاو، لەنێو گۆبەندی سەدو یەك وەهمی ئەخلاقیدا ناوێرن چاوو دەستو دەمیان ببزێون.

بەو مانایەی ئەو کەسایەتییەکی دووفاقی نیە، لە دیوەك خۆ بکاتە پاڵەوانو لەدیوەکی دی داهێزرابێ، هەروەها روحیەتێکی منداڵی هێندە جوانی لەخۆدا پاراستوە، ئەودەمەی دەگەڵی دەکەویە قسان لەدڵ ڕا هەست دەکەی چەند ئەدیبێکی ناسکە تووشی سەرەگێژەت ناکا بەقسەو دروشمی بێمانا.

قسە لەسەر ئەوە نیە، کە ئەحلامی پەنجاو نۆ ساڵە ئەوەندە بەدلگەرمی داوای گۆڕان دەکا، ئامادەیی خۆی پیشاندەدا، تا کوشتن پاشەکشێ نەکا بەشانازی باس لە شەهیدبوونی خۆی دەکا، ئەگەر ببێتە شەهیدی قەڵەم، چەند جوانە ژنێك بەو بێپاڵپشتیو تەنهاییەی هێندە ئازا بێت، دەست لەخوێنی خۆ هەڵگرێ بۆ قەڵەم، ئەوا ئەگەر ژنە نووسەرێکی عارەب یا هەر کوێندەری بوایە لەنێو نووسەری کورد دەبوو بە پاڵەوانو بەقەولی خۆیان بە ستایشەوە بەرهەمەکانیان وەردەگێرا، ناوەکانیان ئەزبەردەکرد کە ئێستێ مۆدەی ناوو بەرهەمی ئەو تەرزانەیە، هەر لەتەنیشتەویش بەدەیان ژنی نووسەری دووبەر نەوەکو رۆژێك بەدڵ ئەو ژنە رەنجدەرە نانرخێنن بەڵکولەقولایی دڵیان را بە جۆرەها پلان دەیبوخزێننو هەولی پەراویزکردنی دەدەن، کاتێك هەموو دڵنیان ئەحلام قوربانییەکی جوانی کولتورێکی دواکەوتوو توندوتیژیو پیاوانێکی ئەدیبی نەخۆشە لەپانتایی ئەدەبێکی پیاوسالارانەدا!!

هەمیشە گفتەکی ئەحلام دێتەوە بن گویچکەم، کە پاش ئەوەی دووسێ حەب قوتدەداو جخارەکەی داگیرسێنێو دەڵێ: پیاوانی ئەدیب وەکو گورگو ڕێوینو هەموو دەمارەکانی سەریان سووتاندم، بەڵام هەرگیز تەسلیم نەبووم نەکشامەوە، بەڕای من ژنی نووسەر ئەگەر تەسلیمی یەك تاکە وشەش بێت لە ژیانیدا، ئەوا هەر زوو باشترە وەفاتنامەکەی خۆی ڕابگەیەنێو نەگاڵتە بەژیانی خۆیو نەگاڵتەش بە ناوی رۆشنبیریو خوێنەرانی بکا.

گەلەك ڕوونە، بوونی دەنگی ژن لەئەدەبی کوردیدا، لەسەدا نەوەدو پێنجی رەمزیە، وەکوو بوونی ژن لە حکومەتو دەسەڵاتدا، لەبۆیە لە مەیدانی رۆشنبیریشدا هەر گروپەو لەبنەوە خۆی لە بازنەی حیزبێکدا قۆرخکردوەو، لەسەرەوەش ڕا خۆی لەیەك لە پیرەکانی رۆشنبیران پەستاوتوەو جێ دەنگی خۆی خۆش دەکاو هەتا لە تواناشی دابێ خۆ لەهەموو راستییەك لەگێلی دەداو بەرەبەرەش بەپێی ئەڤ ستانداره باوەی دەقی پێوەگرتوەو بۆی دارێژراوە دەنووسێو بلاودەکاتەوە، پلان بۆ ناودەرکردنو ناساندنی خۆ دەتەنێ، وەکو لەنێو هەمووکایە رۆشنبیرییەکاندا بۆتە مۆدەو باو، پەلاماری سێ بابەتان بدەی بە زەقیو راستەوخۆیی، ئەویش سێکسو ئاینو بەرپرسانن! ئەوا باش ناسراو دەبیو دەبیە وێردی سەرزمانان، تاکە ژن لەمەیدانی هەر ئەدەب نا، بەڵکو هەموو کایەکانی ژیان!

ئەز بەبوونی ژنێکی ئەدیبی وەکو ئەحلام مەنسوور، گەلێك کەیفخۆشمو، دڵنیام ئەگەر ئەو هەراجخانە سیاسیو رۆشنبیرییەی

ئێستای کورد نەبوایە، ئەو ژنە سەداو پایەیەکی درەوشاوەی دەبوو. لێ سەرەڕای ئەوەش ئەحلام پایەی جەسارەتی هەمیشە جێی خۆی هەیە، ئەگەر پاش ساڵ لێرە بەدواش بێت.

بەدڵ هێڤیەش دەکەم ئەحلام هەموو یادگارییەکانی ژیانی بە خۆشیو تفتییەوە بە هەڵکشانو داکشانەکانیایەوە بڵاوبکاتەوەو، هەموو یاداشتەکانی خۆی چاپ بکاتن بە بێ لادانو سڕینەوەی ناوی هەر نووسەرو کەسایەتییەك، هەر برادەرو هەر دۆستو دڵسۆزێك، چونکە لێم ڕوونە یەکەم دەسپێكو رەچەشکاندنێکی دی دەبێ، دووەم جیگەیەکی تایبەت دەگرێ لە مێژووی ئەدەبی ژنی ئازاو ئازاد دا، سێیەم وەڵامێکی جوان دەبێ بۆ هەموو ئەوانەی دەخوازن لە مێژووی کەمکەنەوە. هەروەها ئەو جۆرە بەرهەمانە ئێستێ پێگەو نرخی خۆیان هەیە لەنێو کتێبخانەو ئەدەبی وڵاتانی پێشکەوتوو.

ژ دوماهیەدا، سڵاو لەچاوی هەموو ئەو رۆشنبیرە ئازایانەی بە هەڵوێستی بەرزو جوانەوە دەژینو دەمرن، ژیانی خۆ بەختدەکەن لە پێناو ئەو پەیامە جوانەی هەیانە، مردنیش بۆ ئەو بیرکوێرانەی هەمیشە دژی پێشڤەچونن.. دووبارە دەبێژم: ئەحلام مەنسوور بەرسڤە بۆ هەموو ئەو چەقبەستوییو سڕبوونو داتەپینەی پێگەو جێزمانی ژن لە ئەدەبو رۆشنبیری کوردی داو، هەتا نموونەی ئەو جۆرە کەسایەتیانە زیاد نەبن، هیچ نوێبونەویەك ڕوونادات‌و دەنگی ژن لە ئەدەبدا هەروا نووزەی لەبەر دێ.

# به مێژووگێڕانی ئەدەب

**هەموو درۆو دزیو هەڵەیەك دەبێتە مێـژوو، بـەڵام زۆر بـە دەگمـەن مێژوو دەبێتە دزیو درۆو هەلە، مێژوو بە هەموو پرسـێك دەگـەڕێ لـێ کەم پرس هەن بە مێژوو دەگەڕێن، زۆر جاران وا رێدەکـەوێ مرۆڤـی زۆر ترسەنۆكو نەزان مێژوو دروستیان دەکا، یا بە پێچەوانەوە مرۆڤی گەلەك بیرکۆڵو دۆڕاو مێژوو دروست دەکەن، لەبۆیە شەرت نییە، تەنها کەسانی ئازاو ڕۆشنبیرو هەلکەوتە مێژوویەك دروستیان بکا یا کەسانی بیرمەندو هۆشیارو ئازاد مێژوو دروست بکەن.**

**نەتەوەو گەلە دواکەوتووەکان تا ئێستاش وا دەڕوانە مێژوو، چـاوەڕێی ئەوەیەیانە لێی هەمـوو خۆڕانانو روکەشکاریو دروشمکاریو سەرکەوتنو کـرداره چـاکەکانیان بـۆ بنووسـێتەوەو، هـەموو تێشـکانو گەمـژەییو کۆڵەوارییەکانیان بۆ داپۆشێو، مێژووی ئاینیو مێژووی سیاسی هەموو مێژووەکانی تری لێ خستونەتە پەراوێزەوە. وەختێك دەرگا لەسەر ئەدەبی زۆربەی گەلانی دنیا دەکەیتەوە، پێش هەر شتێك مێژووی ئەو میللەتەت لە ئەدەبێکی باڵاو بـە زمـانێکی تۆکمـە وەبەرچـاو دەکـەوێو، هەسـت دەکەی مێژوو چۆن بە پارێزراویو چۆن بە راسـتگۆییو بـە چ هونـەرێك وەرگەڕێنراوەتە سەر ئەدەبو چ نەمرییەکی بەخشیوەتە ئەڤ ئەدەبـە، بـە**

دیوێکی دیدا کە دەرگا لەسەر مێــژووی زۆربــەی گــەلانی دنیــا هاوەڵــە دەکەی توشی هەژەند دەبی، وەختێك دەبینی ئەدەب چەندە بە پــیرۆزی بــە شارەزایی‌و بەئەمانەتەوە لە مێژوویاندا جێگەی خۆی بۆ تەرخان کردوەو، چۆن ئەو مێــژووە ئەدیبــەکانی نــەمرکردون‌و پاراســتوون. بــە هــەزاران بیرمەندو زاناو ڕۆشــنبیر کۆببنــەوە نــاتوانن پەڕەیــەکی مێــژوو بگــۆڕن‌و لەبەریەکی هەڵوەشێنەوەو پاکنووســی بکەنــەوە، بــەڵام مێــژوو دەتــوانێ زمان‌و دڵو هزری هەموو نەتەوەیەك بە ڕۆشــنبیرو بیرمەنــدو زاناکــانیوە بهێنێتە گۆڕین.

پاکتــاوکردن‌و هەڵوەشــاندنەوە، گــەلانی کۆڵــەوار نــە سیاســەتی مێژوویی‌و نــەپلانی مێــژوویی‌و نــەداهێنانی مێــژووییان هەیــەو، هــەر بەردەامیشن لە نووسینەوەی مێژوویان بە هەڕەمــەکی‌و کاوێژکردنــەوەی مێژووەکەیان‌و بەڕادانی مێژووەکەیان‌و، سەنگەر دانانن بەرامبەر ڕەخنــە لە مێژوو یان تێفکرین لــە مێــژوو، شــێوازی نووســینی کــاری هــەموو ڕۆشنبیرانە. ئەڤ گەلانەی خــافڵن لــە ڕەخنــەگرتن لــە مێــژووی خۆیــان‌و هەڵکۆلینی مێژوویان بە چەند چــاوو دەســتان، هەمیشــە لەپاشــەوەن‌و مێژووەکانیان تەنها وەکــی دروشمێــك وایــە بــە دەســتیانەوە، ژ بــۆ هــەر پرســـیارو قـــەیرانێکیش مێـــژوو بـــە وەڵام دەهێننـــەوە، ژ بـــۆ هـــەموو کەمووکورتییەك مێژوو دەکەنە گەواهی، بە هەزاران کــەس لــە دنیــادا تێدەکۆشن‌و دەکارن‌و ژیان لە دەست دەدەن، بۆئەوەی بچنە ناو لاپەڕەکانی مێژووەوە بێ ئەوەی بزانن دەرکەکانی مێژوو بە ڕێکەوت دەکرێنەوەو، زۆر جارانیش کلیلەکانیان بە دەست مێژوونووســانێکی ناکامــڵ‌و ترســنۆك‌و

بەربارن.. مێژوونووسی نەتــەوە دواکــەوتوو و  بندەســتەکان پەکەوتــەترو نەخوێندەوارترو بیٚ جیهانبینیترن لە سیاسی‌و رۆشــنبیرو ئەکادیمیــەکانی ئەو نەتەوانەو، لەو خەت‌و سنوورەکێشراوەکان واوەتر قەڵەم نابزێون‌و چاو هەڵنایەنن، دڵنیاشــن رۆژێــك نایــە رەخنەیــەك پێبگــاو هــەموو پــرۆژە سواوەکان هەلتەکێنیٚ. کاتی ئەوە هاتووە هەموو بزانین مێژوو ژ هــەموو شتێك پتر جەسارەتی پێدەویٚو، نەمێژووی بیٚ بەئەدەب گەراوو نەئــەدەبی بیٚ بە مێژووگەراو وەکی پوشی بەربان‌و کەس نایانبینیٚ.

لەندەن: ١/٦/٢٠٠٦

## کۆڵەواری ڕۆشنبیری

پووچی سیاسی دەرهاوێشتەی پووچی ڕۆشـــنبیرییە، چـونکە کاتێـك ڕۆشنبیر دیدو هەڵوێسـتی نـەبێ لەمــەڕ هــەر گۆڕانکـاریو بزاوتێکـی سیاسیو کۆمەلاٌیەتی ڕای بەهەند وەرنەگیریٚو کەسایەتییەکی کەنـەفتی هەبیٚ، ڕۆشنبیرێکی پووچەو چەند خۆی پفدا بەرگەی نووکـە دەرزیـەکی سیاسەتمەداران ناگریٚو پووچ دەبێتەوە.

ڕۆشـــنبیری دووفــاق کەســایەتییەکی مــرداری هەیــە، بــەو مانایـەی هەمیشە هەلەکوتـەی ژیـانێکی ئـارامو گـەرمووگوڕو خۆشـی بۆخـۆی هــەبیٚو ئامادەنــەبیٚ بــۆ تاکــە ڕۆژێــك لــەژیانێکی ســەختدا بــژیو لەنووسینەکانیشیدا ئاماژە بە چەقبەستوویی سیاسیو ڕۆشـــنبیری بکـاو بە دیدێکی ڕەخنەئامێز سەرنجان بوەشێنیٚ.

ڕۆشنبیر ئەگەر لووس بوو قەت دانامێنیٚ لەوەی چ دەنووسیٚو چۆن بە پێچەوانەیەوە گوفتارو کردار دەکا، بۆی گرنگ نییە چلۆن ژیانی تایبەتی خۆی تاوەداو دەپاریزیٚ، چ بێتە پیشی وەبەری دەداو ڕاییی دەدا چ کـردارو هەڵوێستی سووکی بەرامبەر بکریٚ گەلەك بە ئاسانی هەرسی دەکا.

ئەز خۆ بەکەمزان نیم، لیٚ دەگەل نقیســینی هــەر شــیعرێك زەنـدەقم دەچیٚو وەکو تەیرێکی بریندار خـۆ لـەولاو لایـان دەکـوتم نـەوەکو لـە

خەفڵەتان شیعری شاعیرێکی دی کاوێژکەمەوەو بجوومەوە، نەك هەر خوێنەر بۆخۆشم نەزانم چم نووسیوەو لەبۆچم ئەوە نووسیوە، زۆرجاری دی چەقچۆوو لەرزم لێدێت نەوەك خوانەخواستە تەواو سەردەرنەبەم لە دەکار بردنی وشەیەك لەجێی خۆیو دەستم هێند کورت بێنێ ئەڤ وشەیە بمرێنم، چەندین شەوانیش خەوم لێ دەزڕێ لەو ترسەی نەکا لەنووسینی ئەو شیعرەیدا تووشی (وشەلێسی) بووبمو هەلەنگووم.

نووسەر کە کەوتە چەقاوەسویە نەترسی لەنووسین دەمێنی نە شەرمیش لەنووسین دەکا، هەر لێی وەنزیك کەوی شیعرێکی حازرو وتارێکی ئامادەکراوو لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمیو لەقوتوونەراو وەرگێڕانێکی پێکهەڵێنراوی دەردەفرتێنێ، بێ لەئاماژەدان بەکتێبە چاپکراوەکانی لەسەر ژیانامەو زیندانو خەباتی خۆی.

ئەز خوێندەوارنیم لەچاو خوێندەوارانی دنیا، لێ هەمیشەش بەئاگام لەوەی نەوەك لەپڕ ئەو خوە بگرمەوە، کە لە هەر سوچەکی کتێبخانەو پەڕەی رۆژنامەو گۆڤارۆکەیەکی ئێرەدا دووسێ دێران بخوێنمەوەو ڕەپوڕاست بە سەقەتی وەریگێڕمە سەر کوردیو وەکو سەرچاوە لە وتارەکانمدا ناوی بێنمو لافی خوێندواربوون بەسەر نووسەرانو خوێنەرانی کوردستاندا لێدەم، هەر لەناوی خۆم ڕا بگرە (نیزم) بەهەر وشەیەکی دەگەڵ بەرژەوەندیم بسازێ بلکێنم.

نووسەر کە پوچ بوو دەکەوێتە لکاندنی نازناوی قەبەی وەك رۆشنبیرو چالاکوانو رووناکبیرو شاعیرو چاودێری سیاسی بە ناوی خۆیەوە دەکەوێتە شەنوکەوکردنی وتەو گفتی فەیلەسوفو رووناکبیرانی دنیاو،

لەخۆڕا خۆ دەکاتە شیکارکەری سیاسیو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریو سایکۆلۆژیو زانستی تاوانو لە هەر هەموو بوارێکدا زمان دەبزێوێ بەبێ ئەوەی زانیاری دروستی پێ بێت .

نووسەر ئەگەر سامەرستۆ بوو، ترسو شەرمی نییە لەوەی هەر ڕۆژەی سەر لە بارەگای گۆڤارێك یا ڕۆژنامەیەك هەڵێنێو داوابکا چاوپێکەوتنێکی دەگەڵ سازبکەن، یا سەر لەچەند ڕۆژنامەو هەفتەنامانو ژووری نێتو بەهەویای گۆشەیەکی بۆ تەرخان بکەن، یان ڕیایی لەبەر چەند ڕۆژنامەنووسان بکات تا هەواڵی چالاك بوونو گەڕانەوەی لە تاراوگەو نوێترین بەرهەمی بە هەواڵ بلاوبکەنەوە، یا سەر لە چەند دیوانی حیزبیو ئاسایش ڕۆکات تا بڕیار بدەن کۆڕێکی بۆ ڕێکخەنو پاسەوانانی ئاسایشی دەگەڵ بخەنو لەهوتێلێکی ئەستێرەدار ژووری بۆ بەکرێ بگرن!! هەر لە هەوڵی ئەوەدا بیت تا بچێ چاوپێکەوتن لەگەڵ بەرپرسانی حیزبیو سەربازیو حکومیدا هەتا سەرۆکدا سازکات.

کۆڵەواری ڕۆشنبیری پەلوپۆی دەهاوێتە ناو زۆر کایەکانی کۆمەڵگەو هەر تاکێکی گۆمەڵگە بۆی گرنگ نیە چۆن ڕەفتار دەکا چونکە لەسەروی خۆی بژاردەیەك نابینێ کە هەستت بکا چاودێری دەکەن یا بژاردەیەك کە خودان خەسڵەتی تایبەتن، لەگەڵ ئەوەی سەرنجی کەسانێك دەدا کە بە ڕۆشنبیر ناسراون بەلام تژین لە سازش بۆ بەرژەوەندی زۆر لاوەکیو مادی .

کۆڵەواری ڕۆشنبیری ئەو دەمانە دەگاتە ترۆپك کە ڕۆشنبیرە نووسەران نرخی ژیانو برادەرایەتیو پەیوەندی لەدەستت دەدەن، هیچ جێی بایەخو

باس نییە، کە نووسەرێك دووچاری مەرگ بێت یا نەخۆش بکەوێت، بەپێچەوانەوەش بۆ مردن یا نەخۆشکەوتنی بەرپرسێکی حیزبی بە پۆل ئەو تاقمانە سەرە دەگرن تا هەر ڕێگەی چوونە ژوورێشیان پێبدرێ، ئەوەی بۆ من جێی سەرنجە مردنی ئەحلام مەنسورو کاردانەوەی ساردو سڕی نووسەران، راچلەکاندنێکی دیکە بوو لە بێ بەهابوونی نووسەر لە ژیانی ئەوڕۆدا، چۆن گۆشەگیربوونی ئەو ژنە تاریفێکی پڕ بە پێست بوو بۆ سووکی ژیانی نووسەران، ئەز زۆر هونەر دۆستم، بەڵام دڵنیام ئەگەر هەر کۆلکەچاوەشێك مردبا هەرای ئەوتۆی بۆ ساز دەدرا، هەڵبەتە بەتەنها ئەوە بۆ ئەحلام نا بەڵکو بۆ موکری هەر هەمان کوشمەبوونو بەڕیکردنە ساردو سڕەم تێبینی کرد، کە پێویست بوو یەکێتی نووسەران مەڵبەندی گشتی مەراسیمی تایبەتی بەخاك سپاردنو تازیەدانانو دانانی تاجەگوڵینەی تایبەت لەسەر تابووتی نووسەران بەڕیوەبەرێ لە پایتەختی رۆشنبیران!! بەڵام ئەو کوشمەو ساردیەی بەڕێکردنی ئەحلام دووپاتی ئەوەی کردەوە ئەو نووسەرەی زوڕناژەنی باوەکان نەبێ مردنیشی بە کپی بەسەردەچێ ...

ڕووی هەرە ڕوونی کۆڵەواری رۆشنبیری لێرەڕا وەدەردەکەوێ کە نووسەرو رۆشنبیران دەچنە ناو پێڕو دەستەو تاقمو دابەش دەبنە ناو تیپەکانی حیزبی سیاسی یان تیپەکانی نووسەران، بێزەوەرترین سەردەمی دووڕوویی رۆشنبیری بەڕێوەدەبەن، (چونکە لە ڕووی بەرێ پێیان نەنگیە مرۆڤ حیزبی بێت لە ڕووی پشتێش خشۆکی دەبنە دەسکەلەی حیزب)، دەشێ ئەو بێسەروبەریو تێکچڕژانەی لە کایە رۆشنبیریو نووسینو

ڕەخنــەگرتن ئــەورۆ دەیبیـــنین‌و هەســـتی پێدەکــەین پەیوەندییـــەکی ڕاستەوخۆی هەیە بەو تێکچرژان‌و بێسەروبەریە سیاســی‌و ئایدۆلۆژیــەی تێکڕای کولتووری کۆمەڵایەتی ژیــانی کوردیــدا تــەنیوە، بۆیــە ئەگــەر بەتەنها ســەرنج لــە ســازدانی کــۆنفرانس‌و ڤێســتیڤاڵەکان بــدەین ئــەو ئەفلیجیە ڕوحیەی نووسەری ئەورۆ دەبینین، لەولاتانی ئەورووپی نا، یــەك ئاوڕ لەئێران بدەینەوە قەت نەمبیستوە یا نەمدیتوە بەپرسێکی حکومی یا سەرەکی حکومەت بەشداری بۆنەیەکی ئەدەبی بکا! بەڵام لە ســتایلە داڕووخاوەکەی ئەوڕۆی کوردیدا هیچ جۆرە جووڵەیەك بەبێ سەرپەرشــتی وتارو ڕێزی پێشەوەی سیاسیەك نابەسترێ! هــەر لــەو چــەند کاتــژمێرەی یەکەمی دەستپێکردنەکەش بەڕێز بەرامبەر کامێرایەکان دادەنیشن دەنا دواتر تاق‌و ترۆقە گوێگر دەبینی هۆڵەکان چۆڵ دەبن!

خۆ نووسەر ئەگەر ســەر بەیــەك لــەو تیپانــە نــەبێ نــە بانگهێشــت دەکرێت نە ناوی دێ‌و نە کەس دەزانێ لە ژیاندا ماوە نە بەرهەمیشی بــە شیاوی لە ڕێی چاپەمەنیەکانیان دادەبەزی ...

کۆڵەواری ڕۆشنبیری نما دەکا، ڕەگ دەهاوێ‌و تاریفدەکرێ بە کۆی ئــەو بێ سەنگییەی کە تێکڕای ژیــانی هــەموو ڕۆشــنبیرو نووســەرو ئــەهلی مەعریفەش دەگرێتەوەو هەموو ئەو کلاســانە دادەشــۆردرێن لــە بــەهاو بەسەرکردنەوە، ڕاو بۆچوونیان دەپوکێنرێتەوە.

## ژنانێك هەن وەكو ئالا دەشەكێنەوە

### مارگرێت جۆرج: ١٩٦٩ - ١٩٤١ ژنە جەنگاوەرێكی ئاشووری

مارگرێت جۆرج لەساڵی ١٩٦١ چۆتە ریزی بزووتنەوەی بەرەنگاری لە باكوری عێراق، لەتەمەنی بیست ساڵی داو لەبەر لێهاتووی لەفەرماندەییدا لەماوەیەكی زۆر كورتدا توانیویەتی كەسایەتیو خۆی بسەلمێنێ‌و بگاتە پلەی كۆماندار، بەهەموو شێوەیەك توانی هەشت ساڵ خەبات بكاو بەكاریگەری بجەنگێ لە جۆرەها سەربازگەدا، كە بەناوبانگترینو گرنگترینیان شەڕی دۆڵی زاوێتە بوو. هەروەها ئەو متمانەو پێگەی خۆی لەدەستدا لەلایەن فەرماندە وە لەو كاتەوەی كە بۆیان ڕون بۆوە مارگرێت بیروباوەری بەرزی ئاشووری لەدڵدایە، مارگرێت لەشەوی ٢٦ بەفرانباری ١٩٦٩ كوژرا، لەكاتێكدا لەگوندێك خەوتبوو بەناوی قەڵاقوومری.

لاپەڕە هەڵدانەوە لەسەر ژیانی ژنێك، كارێكی چەند جوانە هێندەش سەختە، بەتایبەت لاپەڕەكانی ژنێكی یاخی‌و سەركێش، زۆرجاران ژنانێك هەڵدەكەون هەر لەسەرەتای تەمەنیاندا ئالایەك بەدەستەوە دەگرن‌و سەربەخۆیی خۆ رادەگەیەنن سەرئەنجامیش بۆخۆیان دەبنە ئالا.

هەندەك ژن ئالآی شۆڕش، هەندەکی دی ئالآی سیاسەتو هەندەکی دی ئالآی ئەدەب.

دەمەکە ژیانو خەباتی ئەو ژنە تێکۆشەرە سەرنجی پەلکێش کردووم، لێ چەندەی عەودالّی زانیاری بووم لەسەر تەمەنو ژیانو زۆر وردکاری تری سالآنی پێشمەرگایەتی، گەلەك زەحمەت بوو بەتایبەت لەسەرچاوەیەکی کوردی جوان ڕاگرتنو پاراستنی نازناوی ئەو ژنە، هیوادارم ناوو مێژووی لەچەند سەرچاوەیەکدا پارێزرابێ، لێرەش لەزۆر سەرچاوانم نۆڕیوە، کە گرنگیان داوە بە مێژووی شۆڕشەکانی کوردو ژنی کورد، هەتا لەناو ئەو وێب سایتەدا کە تایبەتە بە ئاشوورییەکان، ئەو لاپەڕە بۆ مارگرێت تەرخان کراوە لەگەلّ پێنج ژنی تێکۆشەری تردا، لەبۆیە هەر بۆ بەرز ڕاگرتنی ژیانو خەباتی مارگرێتو وەکو ناسنامەیەکی کورتی.. وەرمگێڕا سەر زمانی کوردی، هەولّدەدەم لەداهاتوودا ئەگەر کارێکی بچووکیش بێت ژیانی ئەو ژنە خەباتکارە بنرخێنم.

بەدرێژایی مێژوو ژنی کورد هەرچەند ژنێکی تێکۆشەرو خۆڕاگرو زیرەك بووە لە زۆر بوارەکانی ژیانیدا، لێ زۆر بەدەگمەن نەبێ ناوو نازناوی نەبۆتە جێی شانازی بۆ پیاوانی کورد هێندەی ناوو نازناوی ژنەکی بیانی بۆیان جێی شانازییە، بۆ نموونە ناوزەدکردنی خاتوو دانیال میتران بە ژنەکی زۆر زیرەكو بلیمەت بەدایکی کوردان، لەبۆیە مێژووش هەر بەو ئاراستەیەدا پەلی هاویشتوە کە لەدیدو دەمی پیاوانەوە بێژراوەو دەبێژرێ.

ئەگەر لە داپۆشینو گڵ وەسەردانی ناوو نازناوو خەباتو قوربانیدانی مارگرێتیێ ڕامێنین دەبیێ گڵ وەسەردانو سڕگوومکردنی ناوی گەلەك دەستەخوشکی مارگرێتێمان لەبیر نەچن چ لەناو شۆڕشداو چ لەناو کایە سیاسیو ئەدەبیو رۆشنبیریەکاندا بەدەردی ئەو براونو مێژوویان بزرەو ناویان سوك کراوە.

مارگرێت لەتەمەنی بیست ساڵیدا لەو بارودۆخە سیاسیو کۆمەڵایەتییە چەق بەستوەی چل ساڵی بەریدا ئەو بڕیارە سەختەی داوەو تاوی داوەتە چەكو چۆتە ریزی شۆڕش، لێرە دەبیێ ئەوە ببتە جێی سەرنجیێ ئەگەر مارگرێت کیژەکی لێهاتوو ئازا نەبوایەو خودان شارەزایی لەهونەرەکانی جەنگ نەبوایە گەلەك زەحمەت بوو لەلایەن سەرکردایەتی شۆڕش ڕێگەی درابا بگاتە پلەی سەربازی هەمەجۆرو هەشت ساڵان بەردەوام بوایە، چونکە زۆر جاران ئافرەتی ئازاو ژیر هەڵکەوتەنە لە زۆر بوارەکانی ژیاندا، لیێ بە راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ ڕێیان لیێ گیراوەو ئەرقەلەیان بۆ دروست کراوە.

مارگریت لەو چەند ساڵەیدا توانیویەتی لەگەڵ پێگەیەکی سەربازی لەناو شۆڕشدا پێگەیەکی جەماوەری بۆ خۆ دروست کا. وەکو دەگێڕنەوە لەساڵانی شەستەکاندا زۆر لەو ترومبێلانەی لە نێوان پشدەرو بیتوێنێدا هاتوچۆیان کردوە وێنەیەکی گەورەی مارگرێتێیان بە جامی پێشێی ترۆمبێلەکەیانەوە هەڵواسیوەو هەردەم بە کۆڵانەکانی قەڵادزێدا تیپەڕیوە، بەکۆمەڵ خەڵك هاتوونەتە دەریێو سڵاویان لیێ کردوە.

**هەشت ساڵ پێشمەرگایەتی سەرکردایەتی کردنی چەندین جەنگو ژیان لەچیایانو لەناو ڕیزی پیاواندا بۆ کیژەك لە پەنجا ساڵی بەرێ کارێکی نەك ئاسان نییە بگرە گەلەك دژواریشە.**

# ئازادبوون له ئازادی

ئازادی که لێی وەژوورکەوتی وەکی ئەڤ دیواربەندە ئاوێنە بەندەیە، کە مرۆ لەهەر لایەکی ڕا بەشێکی ڕووی خۆ دەبینێ، دەکرێ بلێین ئازادی هەرگیز هەموو ڕووو لایەکانی خۆت پێکەڤەوە پیشان نادا، لێ دەوروبەر هەموو ئەدگارو دیوەکانی ڕووت بە جوداو بەتێکهەلکێشی دەبینن‌و ڕاڤەی دەکەن، بەو مانایەی ئازادی دیوێکت بە دەوروبەر پێشاندەدا کە بۆ خۆت هەرگیز نایبینی، ئازادی هەمەدەنگ‌و هەمەڕەنگ‌و هەمە مانایە، هەموو مرۆیەك دەتوانێ بچتە نێو ڕوو ڕەنگێکی ئازادی، لێ گەلەك بەدەگمەن نەبێ ئازادی لە هزری مرۆیەکدا هەلناقولێتەوەو ڕۆناچێتە ناو ڕوحی، مرۆگەلێك لە دنیایەدا بەتەنێ بەچاو دەچنە ناوئازادی مرۆگەلێکی دی بە زمان‌و، هەندەکی دی بە هزرو هەندەکی دی بەزەین‌و هەندەکی بەجەستە، لەبۆیە کەم مرۆڤ بە هەموو ئەندامەکانی جەستەیان دەچنە ناو ئازادی‌و، ئازادیش زۆر بە دەگمەن نەبێ بە هەموو ڕەنگ‌و دەنگ‌و مانا فرەزاراوەکانی لە قولایی مرۆیەکدا ڕەگ دادەکوتێ، هەموو ئازادیەك دەبێ بە قوولی بێتە تێهزرینێ، چونکە دەمی واهەیە مرۆ دەگاتە خالێکی ئازادی پێی وایە تەواو ئازادەو، بۆ

هەموو پرسێك ئازادی دەكاتە دروشمو دەیەوێ هەتاهەیێ خۆ بە ئـازادی هەڵواسێو بەدەستبەسەر لـە دەوروبـەری بڕوانـێ، تـاریفكردنی ئـازادی هێند هەمەڕەهەندە، كە گەلێك بە سەختی زەینو زمان دەرەقەتی دێـنو سەری لێدەردەبەن، هەروەختێك مـرۆڤ ئازادییـەكی خۆڕسـكو تۆكمـەی لەناو هزریدا هەڵێنجاو، ئازادییەكی تۆكمەی لەناو زمانیدا وەسـەریەك نا، ئەو دەمی دەبێ دەستو زمان لە بۆ هەر كایـەكی سیاسـی ئـەدەبیو مێژوویی بەرێ هەڵەتە نـابێو بەتـەهنێ لـە چـاوی خـۆ را لـە ئـازادی ناڕوانێ، هێندەی پێویست دەستو زمان هەڵدێنێ، لێكهەڵاوێرنـەكردنی ئازادییەكان هەمیشە بـەڕووی نەتـەوە بندەسـتەكانەوە دیـارەو، هـەموو دەمێ بـەبێ ئـەوەی هـیچ تێـڕوانینو پڕۆژەیـەكیان هـەبێ، بـەكتوپڕیو بەسەرسامی زەینو چاوو باوەش لـەبۆ هـەموو ئازادیـەك ئاوەڵادەكـەنو، پێشیان وایە چۆن مێژوو سیاسەتو ئەدەب لە قاڵب دەدەن دەبێ ئەوهاش ئازادی بپارێزن، هیچ وەختێك نابنە خودان گوتارێكی ڕەخنـەیی لەسـەر ئازادیو ڕەهەندەكانی.

هەندەك مرۆڤ خوو بە ئازادییەوە دەگـرن، هـەتا ژیـان بـەڕێ دەكـەن ئاگایان لە هیچ نییە لەبەر تاریفی ئازادی گەیشتن بـە ئـازادی، هەنـدە مرۆڤی دیكەش نەخۆشی ئازادی دەگـرن، نووسـەرو سیاسـیو ئەدیبـی نەتەوە بندەستەكان بەر لەهەموو شتەك خوو بەئازادییەوە دەگـرن بـەبێ هیچ بنەماو ڕەچەڵەكێكی فیكریو، هێندە زمـان كـورتن وەكـی تـوتی هێندە ئەو وشەیە دەڵێنەوەو بە هەموو بەرەڵاییو ڕەهایەك سەرسام دەبنو بەدەسكەوتی ناوزەند دەكەن.

ئـــازادی بەهـــەموو وشـــەیەك پێناســـەدەكرێو، دەگـــەڵ هـــەر وشـــەو دەستەواژەیەك تێكـەڵ بكـرێ مانایـەك دەدا، مانایـەكانی هێنـدە زۆرن هێندە وردن هێندە چڕن گەلێك ئەستەمە هەموو مرۆڤێك تـەواو لێیـان حاڵی بێ، بۆ نموونە ژنی ئازادو كوردستانی ئازاد، رۆژ نییە لـە چـەندین دەزگاو كەناڵی راگەیاندا نەوەشێنرێنو بەبێ ئەوەی نـەژنی كـورد ئـازاد بێتو نەكوردستانیش ئازادبێت.

لێـك هەڵاوێردنـەكردنی ئازادییـەكان، ترسـێكی گەورەیـەو هـەموو ئازادییەك پەیوەندی راستەوخۆ یا ناڕاستەخۆی هەیە بە ئازادییەكی ترەوە وەكو ناوەرۆك، لەبەر هەندێ ئەگەر مرۆڤ زۆر زانـا نـەبێ نـاتوانی هـەر یەكێكیان بپارێزێو هەست بەو سنوورانە بكات، كە هەر هێندەی تاڵـە موویـەكنو بـە ئاسـانی دەبـەزێنرێنو، دەگـەڵ چـوونە نـاو ئازادیـەكو پراكتیـك كردنـی ئازادییـەك دەبتـە هـۆی پێشـێل كـردنو شـێواندنی ئازادییەكی دی.

بۆیە زۆربەی ئەو ئازادیانەی ئـەورۆ بوونەتـە دروشمێـكو، سـەرتاپای كۆمەڵگەی كوردی پێی سەرقاڵ بـووە، ئەگـەر بـەوردی تێیـان ڕامێـنن دەبینین هەریەكەیان بۆ بەرژەوەندییەكی تایبەتی حیزبێك یـا تاكێـك یـا دەزگەیەك دەكار دەبرێو پاش ماوەیەك لەبیر دەكرێ.

بۆیە ئەو ئازادییانەی دەبنە هۆی دەسخەرۆبوونو دەستەوەستانیو بـێ بەهابوونی ژیان، لێ ئازادبوونیان ئازادییەكی بەهادارە.

# ئاوێنەی کەسایەتی ڕۆشنبیر زمانە

* ئەو مرۆڤانەی دەگەنە ترۆپك لەژیاندا ئەو مرۆڤانـەن، کەهـەموو دەمـێ بەوردیو بەچڕیو بەخاوێنی زمانی خۆیان پەروەردەکردەوە.

زمانی مانی کەسایەتی تێڕا دیارە، مرۆڤ دەبێ گەیشتبێتە قۆناخێکی بالاّ لەمەعریفەتو زانست، ئەوجار زمان هەڵێنێ، نـەوەکو بـەزمانێکی خاوو زەلیل خۆی بکاتە خـودان پرسـی چارەنووسسـازو خـۆی لەهـەموو پرسان هەڵقورتێنی.

لەو دنیایەدا مرۆڤ هەنـە هـەموو ژیانیـان لەدەسـت دەدەنو گەلـەك بەسەختی دەژین، لێ تا دەمرن ناهێڵن مانیان درزەکی تێکەویو زمانیان پیس بێ.

* زمـــان کۆڵەکـــەی پێگەیشـــتنی هـــەر نەتەوەیەکـــە، نەتـــەوە پێشکەوتووەکان نەخشەی تایبەتی خۆیان هەیـە بـۆ رسـکانو بزاوتنـی زمانی سیاسیو زمانی ڕۆشنبیریو زمانی کۆمەلاّیەتیان، بـەلاّم نەتـەوە دواکەوتووەکان بەتاکە زمـانێکی کـرچو کـاڵ دەبـەر هـەموو پرسـێکی سیاسیو مێژووییو ڕۆشنبیری ڕادەچنو زمـانێکی مـەتاتی بـۆ هـەموو پرسێك دەکار دەبەن بەو مانایـەی چـەند لەبەرژەوەنـدی تاکـە کەسـیو دەسەلاّت دابێ ئەوەندە دەیوەشێنن.

* نووسەر رۆشنبیرو ڕۆژنامەنووسی نەتەوە دواکەوتووەکان بەدەگمەنیان نەبێ، هەموو زمانیان (بەردو ستێیەکە)، چ بابەتێك بازاڕی هەبێ‌و چ بابەتێك بەمەیلی دەسەڵات بێت، بەزمانی ئەوان گڕ دەگرێ‌و گڕدەکەوێ‌و گەرم دەبێ‌و ڕووناکی دەکەوێتە سەر، بەو مانایەی بەزمانی باو هەموو پرسە باوەکان دێنە شرۆڤەکردنێ‌و بەچەندین دەزگای زمان فرۆشتنێ‌و سەنتەری زمان فرۆشتنێ‌و زمان کێومالٚ کردنی بەناوی ناوەندە رۆشنبیریەکاندا دەوەشێنن.

* جیاوازی لەمابینی زمان فرۆشتن‌و لەش فرۆشتنێ لەهەندەك کۆمەڵگەدا هێندە بەبرەوە، هەمیشە لەش فرۆشەکان بەقێزەوەنترین چاو تەماشا دەکرێن‌و جۆرەها ناتۆرەیان بەدوودەدرێ‌و تەواو هەڵداویژرێنە دەری ژیانی کۆمەلآیەتی، لێ زمان فرۆشەکان بەکەیفی خۆیان پێپرکە بەناوو بەوێنە لەناو رۆژنامەو کتێب‌و میدیادا دەکەن، بەو مانایەی لەشفرۆشەکان لەهەموو گۆشەکانی ژیان دەتەرێنرێن، لێ زمان فرۆشەکان کێهە گۆشەیان بوێت لەهەستیارترین کەناڵی سیاسی‌و رۆشنبیری بەکەیفی خۆیان خۆ دەوەشێنن.

* دەسەلآت بایی هەندێ نووسەرو قەڵەم بەدەستەکان‌و رۆژنامەنووسەکانی هەڵسەنگاندون‌و، دڵنیایە لەوەی تا چەند زمانیان بڕ دەکاو تا چەند زمان دەوەشێنن، لەناو ڕەگەکانی خۆیدا زمان فرۆشی بەئەزمونی پەروەردە کردون، کە جلەوی ئەو پرسەیان بەئەمانەت گرتوە.

* زمان فرۆشەکان زمانیان وەها خاراوە، چیان پێ ئامانج بێ چۆنیان بوێ لەهەموو کاتێکدا پێی دەبێژن‌و بچنە ناو هەر کایەکی ئەدەبی‌و

سیاسی هەر خەریکی خۆبردنە پێشیّ‌و زمان بردنەپێشیّ‌و خۆ دەرخستنیّ دەبن.

* لەشفرۆشەکان تا دەمرن هەر سەرقاڵ‌و لەدڵەڕاوکێی ئەوەدان کە مامەڵەی بەبڕشت بکەن‌و کڕیارەکانیان لیّ نەترەکنەوەو، هەموو دەمیّ هەر خەریکی خۆڕزاندنەوەو گەنج ڕاگرتنی خۆیانن، لیّ زمان فرۆشەکان هەتا دەمرن هەر لەدڵەڕاوکێی ئەوەیانە، چۆن دەسەڵات بەخۆ سەرسام بکەن‌و هەر خەریکی ڕازاندنەوەی زمانیانن.

* زمان فرۆشەکان لەتەنگژەو پێشهاتی ترسناك‌و چارەنوسسازدا زمانی خۆ وێك دەنێن‌و دەست بەزمانی خۆ وە دەگرن‌و بیّ هەڵوێست دەچنەوە کەوڵی خۆیان‌و هەموو شتێك بۆ دەسەڵات بەجێدەهێڵن‌و خۆیان لە قەرەی بەرژەوەندیە نەتەوەیەکان نادەن.

* ئەگەر پتر ڕۆچینە ناو پێکهاتەی کۆمەڵگەە دواکەوتوەکان دەبینین دەسەڵاتی سیاسی هەمیشە کەناڵێکی مامەڵەکردنیی بۆ زمانی کڕینی بۆ زمانی کڕینیّ تەرخان کردوە لەخاوەن قەڵەم‌و نووسەرکانی‌و بەجۆرەها ڕێبەستی ناراستەوخۆ دەکەوێتەکڕینی زمانەکان‌و قۆرخکردنیان.

* نەتەوە دواکەوتووەکان کە دەگەنە قۆناغێك‌و دەکەونە ناو ئەو تەنگژەییەی کە زمان فرۆشەکان هەڵکەوتەیی هەرەباڵاو خودان پێگەی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و ڕۆشنبیری کۆمەڵگا بن لەهەر کایەکدا دەبینی کەس زمانی خێر بەکەس دانانیّ‌و هەرکەسە لەڕووە، بەجۆریك دەپەیڤیّ‌و لەپاشەملێش بەجۆرەکی دی.

* زمان فرۆشەکان گەڕەلاوژەی رۆشنبیری دەنێنەوەو بەهەموو لایان ڕا بەهەموو شێوازان تاریفی خۆیان دەکەن‌و خۆ بەمەغدور دەزانن، بەهەموو شێوازان دەپاڕێنەوەو تێکڕا یەك جۆرە وشەو ڕستەو ئاوازو فۆنت کۆپی دەکەن‌و تاریفی جۆرە دیاردەیەك دەکەن‌و وەك یەك پێی هەلاّدەلێن‌و تێکڕا بەگژ یەك دیاردەدا دەچن‌و دژایەتیی دەکەن.

* زمان فرۆشەکان زمانیان هێندە باوە دەگەڵ ئاستی کۆمەڵگە پاشکەوتووەکان یەکە، لەبۆیە هەمیشە بەو زمانە باوەیان سەرنجی تەواوی کایەکان ڕادەکێشن‌و لەکێشە باوەکانیان دەدوێن‌و دەبنە پاڵەوانی بەرچاوانیان.

* نەخوێندەواری‌و ناهۆشیاری هەندەك کۆمەڵگە لەئاستێکی هێندە نەوی‌و کرچ‌و کاڵە، کە هەر زمان فرۆشێك بەکەیفی خۆی‌و لەهەر کەناڵێکی مەبەستی بێت‌و بەرژەوەندی بێت، خۆی دەگەیەنێتە هەستیارترین کەناڵی دەسەلاّت‌و چۆنی بەرژەوەندی بڕوات، ئەوها مێژوویەك بۆ خۆی بە ڕادان دەدا.

*زمان فرۆشەکان کە لەنێو کایە رۆشنبیریەکاندا سەرهەڵدەدەن دەکەونە دڵ شکاندنی هەموو نووسەرو رۆشنبیرانی دی‌و بێ ئاگادەبن لەوەی کە هەموو دەزانن بە چ ڕێگایەکدا وەسەرکەوتوون‌و دەستیان بەکوێوە گرتون.

* ئەگەر ورد سەرنجی خۆ بدەینە مانای کلکەسوتیێ‌و زمانەسوتیێ هەست دەکەین کە هەردووك یەك ئامانجیان هەیەو لەبۆ یەك بەرژەوندی هەڵدەسوڕێنرێن‌و یەك نەخشە دەکار دەبەن.

* زمان فرۆشەکان لەپاش جێگیربوونو وەدەست کەوتنی دەسەڵاتێکی سیاسی گەلەك بەمنجڕی لەخۆ دەگۆڕێنو کلکەسۆتەو زمانەسۆتەکانی خۆیان لەبیر دەکەنو تانەو توانج لەهاوپیشەکانی بەرێ یان دەگرن کە هەر خەریکی ڕانانی زمانیانن بەنووسینی وتارو لەچاپدانی کتێبو بابەتی سەمەرە لەناو رۆژنامەو گۆڤاراندا.

* زمان فرۆشەکان کە دەخرێنە ناوەندی رۆشنبیری وەکی رۆبۆتێك دەکەونە خڕکردنەوەی وتارو شیعرو چاوپێکەوتنە تەلەفزیۆنیەکانەشیان دەیانکەنە کتێبو لەدەزگایەکی سەربەخۆیاندا دەیانهێننە وەشاندنیو لەخۆڕا دەکەونە خۆ قەرەباڵغ کردنیو واپیشان دەدەن کە هەڵسورێنەری هەموو رەوشە سیاسیو رۆشنبیریەکانن خۆ بەجۆرەها قسەی گەورەو وشەی ئینگلیزیو ناوی فەیلەسوفان پف دەدەن.

دەکەونە پەلەقاژێ بۆ ئەوەی چ نووسەرو گۆرانیبێژو شایەرو زمان بازاڕی وەکو خۆیان هەیە، کە لە تاراوگە دەگەڕێنەوە پێشوازیان دەکەونو لەهۆتێلەکان میوانداریان دەکەنو جۆرەها کۆڕو کۆنفرانسیان بۆ ڕێکدەخەنو بەهەموو شێوازان لە میدیایەکان ڕا دەیانهێننە بەرچاوان.

* زمان فرۆشەکان کە لەنێوان کایە رۆشنبیرییەکاندا سەر هەڵدەدەنو خێرا دەکەونە گەمەکردن لەنێوان دوو حیزبی بەرهەڵستکارداو، لەلای هەریەکێکیان وا نیشان دەدەنو زمانیان وا دەبزوێن، کە حیزبی بەرامبەر بەهەموو شێوەو نرخێك ئامادەیە دەسەڵاتیان پێ ببەخشیو بیانکاتە پاڵەوانو بلاجکتۆرەکانی میدیایان بخاتە سەر، بۆ خۆشیان هەمیشە وا بە رۆشنبیران نیشان دەدەن، کە

دەسەلاٌت بەهۆو لەبەرخاتری ئەوانو کارامەیی کەسایيەتیەیان ڕێز لەهەموو نووسەرو ڕۆشنبیران دەگرێو لەڕێگەی ئەوان ڕا خواستەکانیان دێنێتەدی.

* زمان فرۆشتن ئەوودەمەی دەگاتە ترۆپك، کە ناسناوی ڕۆشنبیرو رووناکبیرو ئەدیبی گەورەو داهێنەر بەسەر کەسانی زمان فرۆشو ناشایستە دابەش دەکرێو، کەسانی شارەزاو ڕووناکبیرو بەتوانا لەجۆرەها کەناڵ ڕاو بەجۆرەها شێوازو پلان دڵ دەشکێنرێنو پشتگوێ دەخرێن، تا نائومێد دەبنو زۆربەیان تاراوگە وەکو کونج هەڵدەبژێرن.

* داتەپینی کۆمەڵگاو نەمانی بەهاو ویژدان ئەوودەمانە دەگاتە بەرزترین ئاست، کە زمان فرۆشیو لەشفرۆشی بەیەك ڕێژەو ئاراستەدا گەشە بکەنو بەرهەمێنترین بازاڕیان هەبێ، ببنە ئاسانترین ڕێگا بۆ ژیانو پارە پەیداکردن، نازناوی جوداو مۆدێرنیان بۆ ببینەرێنەوەو پێوە بلکێنرێن.

* زمان فرۆشەکان کاتێك ئامانجی خۆ دەپێکن، دەکەونە جێ خۆشکردنو موچە بڕینەوە بۆ دۆستو هاوەڵەکانیان کە پێشتر سەر بەیەك حیزبو ئایدۆلۆژیاو گروپ بوونو، بەرە بەرە دەست دەدەنە چنینی تۆڕی ناوچەگەریەتیو حیزبگەرێتی موگناتیسیانە یەکتر ڕادەکێشن.

* دڵشکانی ڕۆشنبیرو نووسەرانی خودان ویژدانو بەپەراوێزکردنو بێ بەهاکردنیانو، بەلێشاو هاتنی نووسەرو چاپەمەنییە کە لەدەرئەنجامەکانی زمان فرۆشتنێ، بەو مانایەی کۆمەڵگایەك ڕۆشنبیرو نووسەرانی ڕاستەقینەو خودان ویژدانو کەرامەتی دڵشکاوو بێ کەس

بن‌و هیچ دەزگاو رێکخراو دامەزراوەیەکی مەدەنی نەبێ نوێنەرایەتییان بکاو، رێزو کەرامەت‌و کەسایەتییەیان بپارێزێ‌و رۆشنبیران ناچار بکرێن، هەرکەسەو لەبەرخۆ دەرگای حیزبێك بکوتێ تا ژیانی زامن بکا بەرامبەر بەزمانی، ئەوە ئەو کۆمەڵگەیە نوقمی زمان فرۆشتنەکی کوشەندە هاتووەو تێیدا زمان فرۆشی‌و لەشفرۆشی بەیەك رێژە گەشە دەکەن.

* نان پەیداکردن بەزمان‌و نان پەیداکردن بەلەش لەنێو ئەو کۆمەڵگەیانەدا پەرەدەستێنێ، کە چەند قۆناغێکیان لەشەڕی ناوخۆ تێپەڕاندوەو دووبەرەکی بۆتە کولتوورو گەندەڵی بۆتە کولتوور.

*جێی ئاماژەیە کە ئەو وتارە تەواوکەری ئەو بابەتانەیە کە لەسەر زمان دەینووسم، بەرێش بەوتارێك زمانی سیاسی بۆ جێی سەرنج‌و تێڕامانێ.

٢٠٠٦/٩/٢٠

# ئاگاداری نامەو پەیمانەکانتان بن
# بۆ جۆرج بوش و ئەمریکا

یاساو رێساو نەریتە سیاسییەکان لەوەپتر هەڵدەگرن، کە مرۆڤ بەهەرەمەکی بەناویان بکەویو بە پێی تەبیاتو خوێندنەوەی خۆی راڤەیان بکاو لەسەریان بدوێ. هەر نەتەوەو دەوڵەتێکیش بەپێی پێگەو ئەزموونی خۆی پراکتیکیان دەکاو، بەپێی مێژووو شارستانیەتی خۆی هەنگاویان بۆ هەڵدێنێو پیادەیان دەکاو بەهەندیان دەگرێ. مرۆڤ دەبێ دەستو زمانو هەنگاو هەڵێنێ، کە دەسەڵاتی بەسەر فیکری خۆدا دەشکێ، لەهەر پرسێکدا بە ئاگابێ لەوەی لەخۆڕا خۆی بە بەرپرسو خودان هەموو رووداوو پرسو تاکێك بزانێ.

دابەشکردنی پۆستو کورسی، یەکە لەگەمە هەرە ناسراوو پڕ نهێنییەکانی سیاسەت، لە زۆربەی وڵاتانی دنیادا لەپاش ئاشکراکردنی ناوی کاندیدو پۆستەکان، زۆر کەس توشی شۆك دەبنو دەحەپەسێن، روونتر بڵێم یەك لە عورفە هەرە دیارەکانی سیاسەت، دابەشکردنی کورسیو پۆستە هەستیارو گرنگەکانە بەسەر ئەندامو هەوادارانی حیزبی خودان زۆرینەو براوەیە لە هەڵبژاردندا، زۆر بەدەگمەن نەبێ رێژەو هاوکێشەو ئۆپۆزسیۆنەکان جێ دەستو کاریگەریان نابێ بەسەر

دابەشــكردنەكاندا، مەگــەر لــەو وڵاتانــە نــەبێ كــە لــە ترۆپكــی شارستانیەتو دیموكراسیدان.

زۆربەی هەرە زۆری سیاسەتوانو رۆشنبیرانی بە هەڵوێست ئاگاداری سیاسەتە تەمومژاویو فرە ڕووەكـی ئـەمریكان لـە ڕۆژهـەڵاتی نـاڤینو كوردستاندا بە تایبەت لەسەر كێشەی كەركوكو مادەی پەنجاو هەشـتو هــەڵكردنی ئــاڵای كوردســتانن لــە كــەركوكو سیاســەتە بریقــەدارو هەڵبەستراوەكەی مافی ئافرەتو، چەسپاندنی ڕێـژەی لـە سـەدا بیسـتو پێنج، گەلەك وردەكاری تریش هەن.

ئەڤەی ڕوونتر دەبتە جێی تێڕامانو هەژەنـدیێ، ئـەڤ نامەیـەی بـەڕێز خـاتوو مــەهاباد قــەرەداغی، ڕاوێــژكار ســەرۆكی حكومــەتی هــەرێمی كوردستان بۆ كاروباری یەكسانییە، كـە بـۆ سـەرۆكی ئـەمریكا جـورج بۆشی نووسیوە بەناوی هەموو ژنانی كوردســتان، كـە لـە هەفتەنامــەی هەولێرپۆستدا هاتیتە وەشان.

پەڕەگرافی یەكەمی نامەكـە بـەو ڕسـتەیە دەسـت پێـدەكا: (بـەڕێز سەرۆك، لە ژنانی كوردستانەوە سلاوێكی گەرمتان ئاڕاستە دەكەم، ئێمە وەك ژنانی كوردستانی عێـراق ستایشــی ڕۆڵــی جـەنابتان دەكـەین بـۆ سەپاندنی سیستەمی چارەكی ....).

ناردنی سلاو بۆ سەرۆكی ئەمریكا، دەبێ لە تێڕوانینو دیدی هەنـدەك ژنو بگرە پیاویشەوە گرنگ بێو جێی دڵخۆشیو بایـەخ بێـت، لـێ بـە بڕوای من هەموو ژنەكی كورد ئەڤ هیواو مەیلو تێڕوانینەی نییە سـلاو لەبۆ سەرۆكی ئەمریكا بنێرێ، دەكـرا نووسـرابا: بـەناوی خـۆم سـلاوی

گەرمتان ئاڕاستە دەکەم، لە پاشان ئێمە وەك ژنانی کوردستانی عێراق ستایشی ڕۆڵی جەنابتان دەکەیین بۆ سەپاندنی سیستەمی چارەکی بیستو پێنج لەسەدا، بە ڕای من هەموو ژنانی کوردستان هاوڕا نین لەسەر ستایشی ئەمریکاو هانا بردن بۆ ئەمرکا، چونکە بایی ئەوە ژنی کورد هوشیاربونەتەوەو پێگەییون، کە بزانن هەر ئەمریکایە خودان ئەڤ سیاسەتەی کە ڕۆژانە چەندین کیژی کورد لە بنارەکانی چیایی قەندیل شەهید دەبنو، ئەڤ سیاسەتە نەك بە ئافرەت هەر بە مرۆڤیش ئاماریان پێناکاو، هەر ئەڤ سیاسەتە بە خۆو بە میدیا قۆرخکردووەکانی ناهێڵێ کەسێك لە دنیادا بەرامبەر لەشکرکێشییەکانی تورکیاو ئێران بچرپێنێ، جا دێت لە خەمی ژنی کوردو ڕێژەو پێشکەوتنیاندا دەبێ.

پەیڤینو پەیام دان بە ناوی زۆرینەی خەڵكو گروپو میلەتو زۆرینەوە، کاریکی ئەوها سادە نییەو دەهێندی ئەوە هەڵدەگرێ کە لەو وتارەدا ئاماژەی پێبکەم. لەبەر هەندێ نووسینو پەیڤین بە ناوی گشتیەوە دەبتە پێشلکاریەك لە ئەخلاقیاتی دیموکراسی، کە بە ڕووی کۆمەڵگە پاشکەوتوو بندەستەکانەوە دیارە کە تاکە لێپرسراوێك بە ناوی هەمووانو لە بڕی ڕاو بۆچوونی هەمووان پێشنیارەکان دەکاو بابەتگەلێك ڕەدەکاتەوە.

نووسینو شێوازی نامە ڕەسمیەکان، کۆمەلێك ڕێسای تایبەت بەخۆی هەیە لە وڵاتانی پێشکەوتوودا بە تایبەت نامە بۆ کەسانی دەسەلاتدارو ئۆفیسەکانیان، لەبۆیە ناو هێنانی سەرۆك بەو شێوازە ڕاستەوخۆیە دەشێ لەسەر زمانی هەندەك کەس بە ئاسانی گۆ بگرێو بە

قەڵەمەکانیان ئاسان بنووسرێ، گەلەك بە زمانێکی سادەو بە وشەی سادە داواکاری ئاراستەو راستەوخۆ وەکو: (جەنابی سەرۆك ئێمە هانت دەدەین پشتگیری زیاتری ژنان بکەیت لەم وڵاتە وێرانەدا).

هەروەها لە پەڕەگرافی چوارەمدا نامەکەی خاتوو مەهاباددا نووسراوە: (جەنابی سەرۆك ئێمە وەك ژنانی کوردستانو عێراق دەنگی نارەزایی خۆمان بەرزدەکەینەوە لەسەر پشتگوێ خستنی ژنان لە پێکهاتەی ئێستای دوو حکومەتدا، داوای یەکسەر دەستێوەردان دەکەین بۆ چارەیەکی گونجاوو شیاوی پیادەکردن بۆ ئەم کێشەیە، دەمانەوێ ئەمریکا لە نزیکەوە مافەکانی ژنان ڕەچاو بکات، بۆیە هانی ئەمریکا دەدەین بێتە پێش بۆ فریاکەوتنمان...!).

پەیڤینو پەیام ناردن بە ناوی هەموو ژنانی کوردستانو عێراق، پەیڤینێکە زۆر جێگای تێڕامانو سەرسوڕمانێیە!!، چونکە ئەو سەرکردە ڕوحیانە یا ئەڤ سەرکردە جەماوەریانە یا ئەو نوینەرانەی بە دەنگی زۆرینەی گەل پۆستیان وەرگرتووە، ئەو پەیامە گشتیانەو بەناوی زۆرینەی جەماوەرەوە دەنووسنو بڵاودەکەنەوە. ئەویش دەگەڕێتەوە لە بۆ ئەو متمانەیەی، کە تێکرای هاوڵاتیان پێیان داون بۆ ئەوەی لە بری ئەوانو پرسەکانیان بپەیڤێ.

هەروەها مەسەلەی دەستێوەردان یەکە لە هەرە پێشێلکارییە یاساییەکان لە یاسا ناوخۆو نێودەوڵەتیەکاندا. ڕاستە دەست لە کاروباری زۆر لە دەوڵەتو نەتەوەکان وەردەدرێ، بە جۆرەها بیانوو نەك بەو شێوە دەربڕینە ڕاستەوخۆیە داوای دەست تێکشکانی سەروەری حکومەت،

دەست تێوەردان بکرێ، هەموو دەستتێوەردانێك مافی هەموو کەسایەتیەك نییە.

مرۆڤ لە هەر جێگاو لێپرسراویەتێکدا بێ، دەبێ هەمیشە لەوە بە ئاگا بێ کە بەناوی هیچ کەسو گروپێکەوە قسە نەکاتو پەیام نەدات. مەسعود محەمەد وتەنی (مرۆڤ چەند لە دەسەلاتو پۆستی بەرزدابێ، لێ خەڵك لەبنەوەڕا لێی دەڕوانن‌و هەموو ئەوانە دەبینن کە لەسەری ڕاوەستاوەو پێیدا وەسەرکەوتووە).

نەتەوە بندەستەکان دیموکراسی وەکی دروشمێك وەردەگرن‌و، هەرکەس بە پێی بۆچوون‌و تیگەیشتنی خۆی مامەلەی پێدەکاو خۆی پێ شارەزایە لێی، نەخافڵن لەوەی کە دیموکراسی لەناوەڕۆکیدا کۆمەڵە ئەخلاقیاتێکە لەناو روح‌و زمان‌و جەستەی هەر تاکێکەوە.

لەبەرهەندێ دەستهەڵێنان‌و زمانهەڵێنان‌و هەنگاوهەڵێنان لە جێی خۆ، هێندەی سنووری خۆیە، کە لە بەرچاوترین‌و سەرەکیترین ئەخلاقیاتی دیموکراسی لەناو گەلە پێشکەوتووەکانی دنیاداو، هێندخودان ئەزموونن لە ئەخلاقیاتی دیموکراسی کە مرۆ بە پەیڤی دەزانن چەند دیموکراسییەو چۆن دیموکراسی گەیشتووەو، کەس بە مافی خۆی نازانی کە لە بری نزیکترین کەسی بدوێ.

لە بۆیە ئەزیش وەك ژنەکی کورد ناتوانم ئەوە پەسەند بکەم کە هیچ کەس بەناوی من‌و لەبری من بڕیار بدا، چونکە من نەهیچ داواکارییەك لە جورج بوش دەکەم‌و نەستایشی دەکەم، لەبەر هەندێ دەبێ کەسانی خودان پۆست‌و شوێنگە لە حکومەتدا پتر وریابن‌و حیساباتی ورد بۆ

نامەو پەیامەکانیان بکەن، بەتایبەت ئەوانەی بۆ خەڵکانی دەرەوەی دەنێرن، چونکە هەموو نامەو لێدوانێك بەناوی زۆرینەی جەماوەرەوە دەچێتە خانەی داواکاری حکومەتو بەهەند وەردەگیریٚو دەبنە دیکۆمینتو مێژوو لە خۆرئاوا، بە مێژوو بۆ نەتەوەی کورد دەنووسرێتەوە. ئەوان حیساب بۆ وشەو دەستەواژەو ڕستەو ڕاڤەش دەکەنو بە یەك لە ئەخلاقیاتی دیموکراسی پێناسەی دەکەنو هزری نەتەوەی ئەو نەتەوەیە لەسەر ڕۆدەنێنن.

# کۆڵەواری جوگرافی

کۆڵەواری جوگرافی نەك بەتەنێ جێی دەستی کۆڵەواری سیاسییەکانی هەر نەتەوەیەکە، بەڵکو کەمتەرخەمی هەرە گەورەو کۆڵەواری رۆشنبیرو نووسەرەکانیەتی.

کۆڵەواری جوگرافی بێ لەنەبوونی سیاسەتی جوگرافی دەرهاویشتەی رۆشنبیری جوگرافیشە، لەبۆیە ئەو نەتەوانەی گرنگی تایبەتو بەبڕشت بە زانستی جوگرافیا نادەنو هیچ ستراتیجیەتێکیان نیە بۆ بەرەوپێشچوونی ئەو زانستەو پەلوپۆ پێ هاوێشتنو نوێکردنەوەی هەمیشە سنوورو قەوارەیان لە ژێر هەڕەشەی هەڵبڕین دایەو هەر دەوڵەتێکی بەهێز مەرامی بێو چ پلانێکی هەبێ پشکێکیان لێ دادەبڕێو وەبەرخۆ هەڵدەبرێ.

ئەگەر پاشخانو پێشینە جوگرافی بۆ هەر تاکێك گرنگی خۆی هەبێو ببێتە خاڵێکی گرنگ لە کەسایەتیدا ئەوا پاشخانو پشتێنەی جوگرافی بۆ رۆشنبیران کۆڵەگەیەکی ئەستەمی کەسایەتیەو دەکرێ رۆشنبیری جوگرافی بەتەنێ دەرهاویشتەی زانستی جوگرافیا نەبێ، چونکە هەندێك رۆشبیر ئەو زانستەشیان نەخوێندوەو دەرچووی هیچ زانستگاو

ئەکادیمیەیەك نین، لێ ئاستی زانیاری جوگرافی خۆیان هێندە کامڵ کردوە کە جێی سەرسورمانن.

کامڵ بوونی رۆشنبیری جوگرافی لەناو هەر نەتەوەیەکدا کۆڵەکەیەکی گرنگی پێکهاتەی هاوڵاتی بوون بە نیشتمانبوونی هەر تاکێکە پەیوەندییەکی چڕوپڕی هەیە بە ئەخلاقیاتی نەتەوەییەوە، بەدرێژایی مێژوو ئێمە نەتەوەیەکین چەوساوینەتەوە یەك لەهەرە چەوسانەوە درندانەکانی بەرامبەرمان کراوە چەوساندنەوەی جوگرافی بووە، ئەمن وەبیرم دێ یەکەم وانەی جوگرافی کە خوێندم جوگرافیای نیشتمانی عەرەبی بوو، یەکەم نەخشەی کێشاشم نەخشەی نیشتمانی عەرەب بوو! پاشان جوگرافیاو نەخشەی عێراق، کە ئەوەندەم رق لەنەخشەکەی بوو ئێستاش فێری نەبوومو وەبزانم زۆر کەسیش لەبیریەتی چۆن پێناسەی دەشتو بانەکانی نیشتمانی عەرەبیان پێ ئەزبەر دەکردین، پاشانیش زۆر بە سەقەتو کەمووکورتی جوگرافیاو نەخشەی گۆی زەویو سەرتاپای جیهان.

لە وڵاتانی پێشکەوتوو بەپێچەوانەوە زەینم داوەتە پرۆگرامی خوێندن لەقۆناغی سەرەتای را هەر منداڵێك دەبێت چاوی بە جوگرافیای دەورەبەری قوتابخانەکەی بکرێتەوە، پاشان ماڵەکەیو هی ئەو گەڕەکەی لێی دەژی پاشان شارەکەیو وڵاتەکەی ئەوجار بەرەبەرە جوگرافیای دنیا! دەرهاویشتنی رەگی جوگرافی کرۆکێکە بۆ هەستی بەنیشتمانی بوون دەبێ قۆناغ بە قۆناغ لەگەڵ مێشكو هەستی هەر منداڵێك بینابکرێو بە شارەزایی پلانی بۆ دارێژرێو کاری لەسەر بکرێ.

زانستی جوگرافیا پەیوەندییەکی تێکهەڵکێشی تێکباهەڵدراوی هەیە دەگەڵ زانستی سیاسەتو زانستی مێژوو، هەروەها جوگرافیای هەر شارێك هەڵقووڵاوی کولتوورو مێژووی شارستانیەتی ئەو نەتەوەیەو پاشان جوگرافیای دەوڵەتەکەیەتی، ئێمە نەك شارەزاییمان لەو زانستەدا نییە، هەتا ئێستا هەر بە کوێرانەو بە کوڵەوارانە لە جوگرافیا گەیشتوین بەبێ پلان وەکو سیاسەتو زمانو زۆر بابەتی دیکەی چارەنووسساز بەتەمای خەڵکی بەجێمانهێشتوە! ئەز دەپرسم نەتەوەیەك نەك هەر ڕووبەری خاکەکەیو شارێك ئەگەر لەخەمی مێژوو جوگرافیای خانوویەکیش نەبێ چۆن دێ باسو تاریفی شارستانیەتو مێژووی خۆی دەکا؟ بە چ دەلیلێکی جوگرافی؟ من ئەوەندەی تاقەتم پێشکاوە بە دوی ئەو بابەتەدا دەستم بزاوتوەو جوگرافیای کوردستان پەلکیشی کردووم، لێ تا ئێستا کتێبێکم نەخوێندۆتەوە هێندەی کتێبەکەی شەهید عەبدولڕەحمان قاسملو کە بەناوی (کوردو کوردستان)ە وردبینانەو زاستیانە قووڵبوبێتەوە ناو جوگرافیای کوردستان، لێ دڵنیام پاش بیست ساڵی دیکەش ناتوانێ لەوە تێبگات ئەو پیاوە بۆ شەهید کرا؟ ئایا سیاسییەکی لەو ئاستە پاش وی دروست بۆتەوە؟

هەروەها هەوڵو کتێبەکانی مامۆستا عەبدولڕەقیب یوسف گرنگیەکی مێژوویی‌و جوگرافیان هەیە.

دڵنیام هەندێك کتێبی دیکەش هەن هەندێك کەسایەتی شارەزای دیکەش هەن، بەڵام ئایا قەت سەرانی سیاسی کورد ڕاتان بەهەند وەرگرتوون؟ ئایا بۆ هەر قەبولکردنی هەر پێشهاتێك ڕاوێژ بە شارەزایانی

مێژوو جوگرافیـای کوردسـتان کـراوە؟ پیگەیـەکی تایبـەت بـۆ دیـدو پێشنیارانانیان دانراوە؟ چونکە من دڵنیام بێ لە زانسـتی جـوگرافی زۆر کەس هەن زۆر کوردانە بەماندبوونی خۆیان شارەزاییان لەسەر سـنووری گوند بەگوندو شار بەشاری کوردستانێ هەیە، کە دەبوو بـەر لـە قایـل بوونی کورد بە مادەی ١٤٠ راوێـژیان پێکرابـا؟ نـەوەکو رۆژی چـەندین بۆینبـاغ لــەمل لەســەر مــادەی سەدوچــل دەئــادخفنو رۆشــنبیری جوگرافیشـیان تەقـەی دێ؟ لەگـەڵ ئـەوەی مـن پێموایـە مـادەی ١٤٠ هەتککردنی گەورەیە بۆ نەتەوەی کورد، هیچ جیاوازییەکی نییـە دەگـەڵ ئەوەی مرۆڤ بۆ خۆی خۆ دەرماندا و بکا لەترسی ئەو خەتەرەی ڕووبەرووی دەبێتەوە، لەبۆیە هەر گوێ راگرتن لە مادەی ١٤٠ زەرەرێکە پەنجا ساڵی داهاتووش کورد باجەکەی دەبێ بدات نەك دانپێدادان بە ١٤٠! دەبوایـە کورد لەسەر جوگرافیای نەك هەر کـەرکوك بـەڵکو گـەڕەکێکی شـاری کـەرکوك‌و دەوروبـەری قوربـانی زۆر گـەورەی گیانیشـی دابـا، ئـەوجار حسێبـی نەتەوەی بۆدەکرا! چونکە هیچ نەتەوەیەك نییە بەبێ خـوێنێکی زۆر بسـتە خـاکێکی خـۆی ئەسـتاندبێتەوە، نـەوەکو بـەو چـەلەحانێ‌و سیناریۆیانەی لە ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك بەڕێوەدەچـن‌و بەقـەولی کاك جەوهەر نامیق چاوەڕێ بین داخوا چاو شین‌و چاوکەسـکە بـەریتانی‌و ئەمەریکیەکان چمان پێدەبێژن‌و چۆن جوگرافیای کوردسـتان لەبەریـەك هەڵدەوەشێنن! ئەوە یەك لە دنیایە نەتەوەیـەك هـەبێت چـاوەڕێی چـارەو ئازادبوون بێ‌و ڕاوێژ بە داگیرکەرانی بکا! خاکی خۆ باوێتە دەسـتیان تـا

**سنووری لەبۆ دیاری بکەن، نازانم چۆن نەتەوەیەك خوێن بـۆ جوگرافیـای نەڕێژێ دەتوانێ بیچەسپێنێ؟**

**کرۆکی سیاسەتەکەی برێمەرو پڕۆژەکەی هـاملتن‌و دیمۆسـترا هـەموو یەك ڕەگەو بە یەك دەزوو وەنراوەتەوە لە یەك سەرچاوەیڕا هەڵقوڵاوە.**

# مەلەفی ئەنفال

**دەنگەکان:** دوای تێپەڕبوونی نۆزدە ساڵ بەسەر کارەساتی ئەنفالدا، ئایا ئەدەب توانیویەتی لە ناو خەیاڵو فەنتازیاو زمان ئەنفالێك دابهێنێ جیاواز بێت لەو ئەنفالەی هەتا ئێستا زمانی سیاسیو ئایدۆلۆژی پێیان ناساندوین؟ تایبەتمەندی ئەو زمانە ئەدەبیە چۆنە کە ئەدەبی کوردی بۆ بەرجەستەکردنەوەی ئەنفال بەرهەمی هێناوە؟ ئاخۆ ئەدەب دەتوانێ زمانێك بێ بۆ بە جیهانیکردنی کارەساتی ئەنفال؟

**نیگار نادر:**

پێم وایە ئەنفال یەکە لەو کارەساتە مێژوویانەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوینو لە سەدەی بیستەمدا ئەگەر بەسەر هەر نەتەوەیەکی دیکە هاتبا جگە لە کورد بێگومان بە زمانێکی دیو شێوازێکی دی پێناسە دەکرا.

ئەنفال ئەو تاوانە گەورەیەی تا ئێستاش ڕەهەندو کاریگەرییەکانی بۆ کورد ڕوون نینو زانستیانە بۆی شینەکراونەتەوەو بەسەریاندا تێپەڕیوە، شوێنەوارەکانی ئەنفال زۆر پڕ مەترسین بەسەر ڕوحو زەینی ئەو نەتەوەیەی ئەنفالکراوە، چونکە ئەنفال هەر قڕکردنو بزرکردنی جەستە نییە بەتەنها، بەڵکو شوێنەواری ڕەگ دەهاوێژێ بۆ قڕکردنی کولتووریو قڕکردنی رۆشنبیریو مەعریفی ئەو نەتەوەیە.

ئەگەر بڕەك بە هۆشیاری لەو نۆزدە ساڵەی بهـزرین کـە بەسـەر ئـەو قڕکردنە ڕەگەزیەیدا تێپەڕیوە دەبینین سێ قۆناغی زۆر هەستیاری بڕیون، ئـەویش قۆنـاغی ڕاپـەڕین‌و ئـازادکردنی کوردسـتان، قۆنـاغی شـەڕی براکوژی، قۆناغی ڕوخانی ڕژێمی بەعسن، کە دەبێ زۆر بە ڕوونی هەست بەو گۆڕانکاریانـە بکـەین کـە ئاراسـتەو شـێوازوکاریگەری هاوکێشـە نێودەوڵەتییەکانی لەسـەر بـەجێماوە، لـێ زۆر بەسـانایی‌و بـەنائاگایی بەسەر کورددا تێپەڕیوەو بەپەلە پرۆزەو کەمتەرخەمی کراوەتـە مێـژوو. تەنها لە مانگی نیساندا وەکو بۆنە یادی دەکرێتەوە.

ئەنفال لە پاش ڕاپەرین یەك بوو لە دروشمە هەرە دیارو دەکاربراوەکان بۆ یەکەم هەڵبژاردن‌و پەرلەمانی کـوردی بۆیـە زۆر بـەگوڕ کەوتبوونـە ژماردنی قوربانییەکانی‌و بەڵێن بەخشین بە پاشماوەی کەسـوکارەکانیان‌و ناونووس کردن‌و بەڵێندان بە بەدواداچوونی چارەنووسیان‌و دابەشـکردنی ئالای کەسك‌و سۆرو زەرد بەسەریانداو بڕینەوەی ئازوقـە بۆیـان، پاشـان سازدانی کۆڕو سیمینارو لاواندنەوە حیزبیەکان نەبڕابوونـەوە کـە کتـوپڕ شەڕی براکوژی هەڵایساو ئەو دوبەرەکیە کوشندەیەی کەوتەوە ئەنفالیشی وەکو هەر پرۆژەو پرۆسەیەکی ژیـانی کـورد دابەشـکردو هـەڵبری‌و هـەر حیزبەو بە پێی سـتراتیژیەتی‌و عەقڵیـەتی خـۆی پێناسـەی بـۆ ئـەنفال نووسی‌و هێندەی پێداویستی خۆی پارەی پێ پەیداکرد، بەحیزبی کردنـی ئەنفال بەبرەوکەوت‌و کەسوکارەکانیشیان لێکهـەڵبواردن‌و هـەر حیزبـەو لەدەڤەری خۆی موچەیەکی بۆ بڕینەوەو لەبەر خـەمی نـان پەیـداکردن‌و نیشتەجێ بون سەرلێشێواوبوون‌و تا بەرەبـەرە کەوتنـە پـەراوێزی ژیـانی

کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی کوردیەوە، بۆیە بەدرێژایی ئەو پێنج ساڵەش کورد لەبەر دەست نانەخوێنی یەکتری ئەنفالی فەرامۆش کرد.

قۆناغی پاشتریٚ شەڕی ئازادکردنی عێراقو رووخانی ڕژێمی بەعس هاتە گۆڕیٚو ئەمریکا ئەنفالی وەکو کارتێکی نویٚ هێنایەوە سەر زمانو بەرچاوانو وروژاندیەوەو گۆڕە بەکۆمەڵەکان لەسەریان هەڵدرانەوەو چارەنووسی ئەنفالکراوەکان زۆر بەرروونی لە میدیایەکان را وەدەرکەوت، لیٚ کورد دیسان لەبەر کێشمەکێشی برایەتی کوردو عەرەبو پەرلەمانیو سەرۆکایەتی عێراقو هەڵبژاردن ئەو سیناریۆ ئەمریکیانە بە شێوەیەکی عەقلانیو بەپیلان کاری بۆ ئەنفال نەکردو بەنەخافڵی ئەو مەلەفەی داختو دەستبەرداری بوو.

ئەوە کۆی ئەو زمانە سیاسیو ئایدۆلۆژییە بووە کە کورد بە درێژایی ئەو نۆزدە ساڵە بۆ ئەنفال دەکاری بردوەو مامەڵەی پێکردوە کە دەکریٚ بڵێین زمانێکی کولو کورت بووە بە وردبینانە بەکارهێنراوە.

لەبۆیە کایەی رۆشنبیریو فیکری کورد هەڵقولاوی ئەو بارو ڕەوشە کۆمەڵایەتیو سیاسییە بووە کۆپی ئەو هەنگاوانەی کردۆتەوە زۆر زەحمەتە بڵێی ئەدەبێك هەیە کرۆکی ئەنفالی لەزمانو فانتازیادا پاراستوە لەچەند دەقێکی دانسقەدا نەمری کردوە، بیٚ لە هەندێك دەقی جوان بە تایبەت شیعر، کە تاکە تاکە نووسراونو بڵاوبوونەتەوە.

لەڕاستیدا دەبیٚ لێرە ئاماژە بە ڕاستییەك بکەین کە زۆر خەمهێنەرە ئەویش ڕەوشی ئێستای ڕۆشنبیری کوردییە کە شوێنەواری ئەنفالێکە بۆ خۆی، چونکە زۆر نووسەری بە تواناو بەکەرامەتو دەقی گەورەو

بەرهەمی بە برِشت هەن لیَ کەس نازانیَ چوَن گلَ وەسەر ناوو بەرهەمیان دەدریَو لەبەر چاوان بزر دەکریَنو دە کتیَبی جوان بلاَوکریَتەوە خویَنەری نییەو رِەخنەی ئەدەبی نییە، بیَ لەوەی هەندەك نووسەرو دەقی بازارِی هەن، کە لە هەموو میدیای کوردی را دەوەشیَنریَنو بەئەدەبی نویَو بەنووسەری گەل ناوزەند دەکریَنو هەر ئەو بابەتانەش زوو چاپ دەکریَنو وەردەگیَرِدریَن، هەروەها هەموو نووسەرو روَشنبیری کورد نە لە کوردستانیَ نە لە تاراوگە نەریَکخراویَك نە دامەزراویَکی راستەقینە هەیە نویَنەرایەتییەیان بکاو خەمی دابینکردنیو چاپو بلاَوکردنەوەو وەرگیَرِانیان بوَ بخوا، حیساب نەکردن بوَ راو دیدی نووسەرو روَشنبیرانو پشتگویَ خستنیانو کوَکردنەوەیان لەیەکیَتیو دەزگاو ریَکخراویَکی تا رادەیەك حیزبیداو وەکو کەمئەندامانو برِینەوەی مووچە بوَیانو چاپکردنی بەرهەمەکانیان...کارەساتە..

لیَرەدا جیَی خوَیەتی چەند پرسان بورژویَنین ئەویش بوَ ئەدەبی ئەنفال لەناو ئەدەبی کوردیدا وەبەرهەم نەهاتو نایێ؟ بوَ کتیَبخانەی کوردی لە قەیرانی داهیَنانو خویَندنەوە چەقی بەستوە؟ بوَ کەسو کاری ئەنفالکراوەکان روَژ نییە لەبرسانو بیَ خزمەتگوزاریان ئەنفالیَ بەچاوی خوَیان نەبینو ئەنفال نەکریَنەوە لەناو ژیانی کوَمەلاَیەتیدا؟ بوَ سەرکردایەتی سیاسی کورد دووبارە ئەنفالی نەکردە سیمبوَلیَك بوَ داواکردنی مافی نەتەوایەتی خوَی؟ بوَ سەدامی دیکتاتوَر لەسەر ئەو تاوانە گەورەیە لە سیَدارە نەدرا؟ بوَ قوربانیو پاشماوەکانی ئەنفال تەنها

داوای قەرەبووی مادی دەکەنەوە؟ بۆ سیاسەت‌و ئەدەبی کورد بەرامبەر ئەنفال لەقەیران کەوتوون؟

ئایا نەتەوەیەك تووشی ئەو قڕبوونە ڕەگەزیە بوویێتەوەو تا ئێستاش لەزانکۆیەکانیدا بەشێك‌و بابەتێك نەبێ لەسەر ئەنفال‌و لەکتێبخانەکانیدا ئەدەبێك نەبێ سەرچاوەگەلێکی زانستی نەبێ بە ناوی لێکۆڵینەوەو قڕکردن یا ئەنفال بەو مانایە ئایا ئەو نەتەوە تووشی قڕکردنی ڕۆشنبیری‌و ئەدەبی هاتووە؟

پشکێکی دیکەی پرسیارەکەتان لەو زمانە دەپرسن کە تا ئێستا ئەنفالی پێ بەرجەستە بووە لەنێو ئەدەبی کوردیدا بۆیە دەکرێ بێژین کردەی ئەنفال کردن بۆتە گەمەو ئەخلاقیاتێك لەنێو کۆی کایە ڕۆشنبیری‌و ئەدەبییەکان، بۆیە ئەو زمانەی ئێستا بۆ بەرجەستەکردنەوەی ئەنفال وەبەرهەم هاتووە زۆربەی زۆری زمانی پاڕانەوەو زمانی لاواندنەوەیە کە زۆر کرچ‌و کاڵ شیعرو پەخشانی لە فیستیڤاڵ‌و مەراسیمی حیزبیدا پێ هاتۆتە وەشاندنێ‌و یا هەر بەو زمانی پاڕانەوەو قوربانیبوونە هەندێك دەقیان وەرگێڕاونەتە سەر زمانی عەرەبی، لەهەمووی کارەساتتر تا ئێستێش زۆربەی نووسەرو ڕۆشنبیری کورد سەرسامەو شانازی بەوە دەکات کە بە عەرەبی دەنووسێ‌و عەرەبیزانەو شاگەشکە دەبن ئەگەر دەقێکیان وەرگێردرێتە سەر ئەو زمانەو دوو عەرەب بیاناسن، ئەوا لەچەندین گۆڤارو ڕوژناماندا ڕیکلامی بۆ دەکرێ کە پێچەوانەی ئەوە هەرگیز بۆ ڕۆشنبیرێکی عەرەب جێی بایەخێ نییە سەرسامبوون بە ڕۆشنبیری ئەو نەتەوەیەی بۆتە هۆی قڕکردنی ڕەگەزی

تۆو لەو دەمیدا خۆ بێدەنگ کردنو چاوپۆشینیان لەو کارەساتە دیسان جێی نائومێدیو خەمو لەسەر ڕاوەستانە، چونکە ئەوانە بە دەگمەنیان نەبێ تا ئێستاش حەساسیەتیان بە ناوی کورد هەیە.

نووسەرو ئەدیبی کورد هەر بەرامبەر ئەو کارەساتە بێ بایەخو خەمسارد نەبووە شەڕی براکوژیش کارەساتێکی گەورەبوو کە دەبوو ئەدەبی براکوژی جێگای دیاری هەباو گەیشتبا ئاستێکی بەرز، چونکە ڕوداوو کەرەستەو پاڵەوانەکانی هێندە زیندوو لەبەرچاوانو گەرمبوون، لێ ئەویش بەسەریدا بازدراو وردەوردە دەچێتە خانەی لەبیر چوونەوە، پاڵەوانەکانی ئەوڕۆ کەناڵە هەرە هەستیارەکانی سیاسیو ڕۆشنبیریان بەدەستەوەن.

ڕاستە کارەساتی ئەنفال نۆزدە ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە، لێ ئەخلاقیاتی ئەنفالکردن وەکو پاشماوە لەنێو کایەکانی کۆمەڵگەدا بەجێماوەو ڕەگی هاویشتوە، چونکە هەموو دەمێ دەبێ ئەوەمان لەبیربێ کە ئەنفالچیەکان کوردبوونو ئێستاش لەپۆستو پێگەی سیاسیو کۆمەلایەتی بەرچاودانو پارێزراون، بەڕای من ئەوە کارەساتێکە هێندەی ئەنفال تراژیدیو کۆکوژو گەورە، بەو مانایەی ئەو ئەخلاقو کولتوورە ڕەگو ڕیشکی هاویشتۆتە ناو ژیانی ڕۆشنبیریو سیاسیو کۆمەلایەتی کوردو پەکی خستوە، ئەو کارەساتە لە بێ ئەزمونی کوردو بێ دەسەلاتیەتی لە بواری زانستی، ئەگینا بەتەنها کاریگەرییە سایکۆلۆژییەکان لەسەر پاشماوەکانی جینۆساید گرنگی تایبەتیان پێ

دەدرێو چەندین لێکۆڵینەوەیان لەسەر دەکرێ، نەکو تەنها داواکردنی قەرەبووی ماڵی.

دەکرێ ئەدەب ببتە زمانێك بۆ بەجیهانیکردنێ کارەساتی ئەنفال، لێ ئەوە ئەو بارودۆخەیە ئەو قۆناغەیە کە ئێستا ئەدەبی کوردی پێیدا تێدەپەڕێ دەستەوەستانی ئەدەبو کولبوونی زمانی مەعریفی کوردە کە گەورەترین کارەساتە، بەمانای ئەنفالبوونو قڕکردنی زمانو فیکرو داهێنانە.

ڕاستە ئەنفال نۆزدە ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە، لێ ئەنفالکردنی کورد بەردەوامە بەناوی دیو بە دروشمی دی، شوێنەواری ئەنفال لەسەر ڕوحی تاکی کورد بەجێماوەو پریشکی هاویشتۆتە ناو هەموو کایەکانی ژیانیو پێویستە کورد چیدی کەمتەرخەمی نەکا، نەوەکو ئەوجارەش وەبەر ئەنفالێکی ئەمریکی کەویۆ خەونەکانی ژێرگڵ کرێنەوە.

# گەڕەلاوژێی ئەخلاقی لە ژن کوشتن‌و ژن بە کوشتداندا

ژن کوشتن بۆتە ئەو پرسەی ئەورۆ دەبێ بە قوولی تێی بهزرین ڕەهەندەکانی شرۆڤە بکەین پلان‌و نەخشەو بکەرەکانی دەستنیشان بکەین، چونکە ژن کوشتن لە ژێر ناوی جوداجوداو لە ژێر دەمامکی جیاجیادا بەرەو ئەوە دەڕوا ببێتە ئەخلاق‌و مەرامەکانی دوژمنانی کورد بپێکێ.

بەخشینەوەی ئەخلاق‌و داماڵینی ئەخلاق بەرەبەرە خەریکە دەبتە دیاردەو ڕەگ دەهاوێتە ناو هەموو کایەکانی ژیان لە بۆیە دەبێ ببێتە جێی هەلۆێست‌و تێڕامانی‌و دەبێ لە خۆمان بپرسین کێن ئەوانەی ئەورۆو لەو قۆناخەی ژیانی کۆمەڵایەتی کورددا ئەخلاق بەسەر خەلکدا دەبەخشنەوە؟

کێن ئەوانەی ئەورۆ ئەخلاق لە خەڵك دادەماڵن؟ ئەو کردارو بابەت‌و ڕەفتارانە چین کە دەچنە ناو پێناسەی ئەخلاق‌و ژێر پێناسەی ئەخلاق؟ کێن ئەوانەی پێناسەکانی ئەخلاقی سیاسی‌و ئەخلاقی رۆشنبیری‌و ئەخلاقی کۆمەڵایەتی دادەڕێژن‌و کێ پێشێلکاریەکانیان سزا دەدا؟

چەمکی ئەخلاق لەهەر کۆمەڵگەیەك بۆ کۆمەڵگەیەکی دی دهێتە گۆڕین‌و ماناو پێناسەی جوداجودا لەخۆ دەگرێ‌و پەیوەندییەکی قوولی

هەیــە دەگــەڵ کولتـــووری ڕۆشـــنبیریو کولتـــووری سیاســـیو پێگـــە مەعریفییەکانی هەر نەتەوەیەك.

گەلەك ڕوونو ئاشكرایە ئەو كەسەی ئـەخلاق بەخشـەكان پەسـەندی نەكەنو بەخودان ئەخلاقو شایستە ناوزەدی نەكەن دەكەوێتـە پـەراویزی ژیانی كۆمەڵایەتیو سیاسیو ڕۆشنبیریەوە، بەپێچەوانەشەوە ئەو كەسەی ئەخلاق بەخشەوەرەكان بیهێننە بەرچـاوانو بـە خـودان ئـەخلاقو ئـازاو خەباتكەر ناوزەدی بكەن ئەوا دەبێتە پاڵـەوانو دەكەوێتـە گەمـە لـەناو هەڵبژاردنی پۆستو لێپرسراویەیەكاندا دەبێتە داهێنەری مێژوو.

بەدیوێکی دیدا ئەو كەسەی ئەخلاق داماڵەرەكان لێی ڕەزامەند نەبن ئەوا بەویستی خۆیان پڕوپاگەندەی بـۆ دەهۆنـەوەو بـە جۆرەهـا شـێوازان هەتكی دەكـەنو دەیكـوژن، بەپێچەوانەشـەوە هـەر كەسـەكی ئـەخلاق داماڵـەرەكان پەسـەندی بكـەن بـە گـوڕ كـاری لەسـەر دەكـەنو پێـی دەگەیـەننو دەیكەنـە ڕكابـەرو تێكـدەری هـەموو بـەهاو جـوانیو پێشكەوتنەكان .

هەر گۆڕانكارییەكی كولتووری كۆمەڵێك گۆڕانكـاری ئـەخلاقی بـە دوی خۆدا دەهێنێت، كە دەكرێ بڵـێین هەنـدەكیان زۆر بـە پێـزن دەبنـە بنەما بۆ بوژانەوەی بەها لەدەستچووەكانو داهێنـانو پاراسـتنی مێـژوو كولتوور، لێ هەندێكیان هێندە قێزەونو خەتەرن دەبنـە هـۆی نـەمانی ویژدانو ڕسكانو هۆی دروسـتبونی (قـەیرانی ئـەخلاقی) دەكـرێ ئـەو قۆناخـە نـاو بنـێین بـە كەوتنـە نـاو قـەیرانی ئـەخلاقی، كـە لـە كۆمەڵگەیەكدا كەس خۆی بە بەرپرسی بنەماو بـەها كولتوورییـەكانی

ژیان نەزانیێو، هەموو تێکڕا بە شێوازی جوداجودا پشکیان هەبێ لە بێ بەهاکردنی ژیانو خۆیان بێدەنگ کەن لە هەموو پێشێلکاریەکانو کەسانی هەڵپەرستو ودۆڕاو لە هەموو کەناڵە چارەنووسسازو هەستیارەکانی ژیاندا خودان بڕیاری چارەنووسسازبن.

هەروەها ئەو دەمەی تێکڕایی هاولاتیان یەك جۆرە بۆچونو دیدیان هەبێ لەسەر هەموو ڕووداوو دیاردەو پێشهاتێكو تێکڕا یەك دیاردەو ڕەفتار بە ئەخلاق ناوزەدکەنو هەڵسەکەوتو ڕەفتارگەلێکی دی بەبێ ئەخلاقی ناوبنێن، ئەو کەسانەی خودان ڕابووردویەکی ڕەشنو لە هەر کایەکدا کتوپڕ هەڵقوولاون بێن ئەخلاق ببەشنەوە بەسەر دۆستو هەوادارانی خۆیاندا، ئەخلاقیش دامالن لە نەیارانی خۆیانو دامودەزگایەکانیان.

هەموو دەزانین کە کۆمەڵگەی کوردی لە سەرەتای دروستبوونییەوە بە گۆڕانکاری وەها تیژڕەوو زنجیرەییدا تێنەپەڕیوەو بەرەو مۆدێرنە نەبراوەتەوە، هەموو کایەکانی پێکڤە نەهاتوونەتە گۆڕانیێو تاکەکانی بەو ڕێژەیە نەکەوتونەتە بەر تەوژمی تەکنۆلۆژیاو کەرەستەو ئامێرو هەتا خواردەمەنی ولاتانی دەریێو بەتایبەتیش ئەو گۆڕانانەی لە کردارو ژیانی ئافرەتدا ڕوویانداوە دەبێ لەسەریان راوەستین، بۆ نموونە ٣٠٪ ئافرەتان هاتوونەتەدەریێو بە شەپۆل هاتوونەتە ناو کاری ڕێکخراوەییو شوفێریو دامەزرانو کارکردن، ئەگەر بەراوردی ئەوە بکەین لەگەڵ چوار ساڵ بەر لەئێستا ڕێژەیەکی زۆرە.

گۆڕانكاری كولتوورییەكە لە گۆڕانكارییە هەرە هەستیارەكانە، چونكە زۆر جاران گۆڕانكاری سیاسیو گۆڕانكاری مێژووییو كۆمەڵایەتی ڕوودەدەن، لێ شتاقیان وەكو گۆڕانی كولتووری چڕوپڕو پڕ گرێ و گۆڵ نین.

ئەگەر بە چاوێكی ورد ئەو قۆناخەی ژیانی كۆمەڵگەی كوردی بخەینە ژێر سەرنجو هەڵوێستو لێدوانێ بۆمان ڕووندەبێتەوە كە ئەو كۆمەڵگەیە پێكهاتەیەكی تێكەڵ بووە لە پاشماوەی ئەنفالو پاشماوەی هەڵەبجەو پاشماوەی براكوژیو پاشماوەی شەڕی عێراق كە هەر یەك لەو ڕووداوو كارەساتو قڕكردنانە كۆگەلێك گۆڕانكاری بە درێژایی بیست ساڵی ڕابردوو بەسەر كۆمەڵگەو ئەخلاقو ڕەوشتی تاكەكانیدا هێناوە، هەروەها هەر یەك لەو كارەساتانە ئەگەر كاریگەری ڕاستەوخۆو ئەخلاقی نەبووبێ بۆ سەر ناخیو ویژدانی هەر تاكێك حەتمەن كاریگەری ناڕاستەوخۆی هەر هەبووەو بەجێهێشتوە، لەهەریەك لەو كارەساتو ڕووداوانە كۆگەلە ئەخلاقو ڕەوشتێك بەجێماوەو چەسپاوە، كۆمەڵێك ڕەوشتو ئەخلاقی دی لە دەستچووەو ئاوابووە.

لێرەدا جێی خۆیەتی ڕامینین لەوەی كۆمەڵگایەك تا ئێستا تژی بێت لە پیاوانی دەست سۆر بە خوێنی براكوژیو پیاوانی دەستڕەش بە تاوانی ئەنفالو هەزارەها پیاوی دڵڕەشی سیخوڕو فایلدار تێیدا حاكمو بڕیاربەدەستو بەدەم بنو هەڵسوڕێنەری ڕەوشی سیاسیو كۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیری بن، ئایا ئەو كۆمەڵگایە لە قەیرانێكی قووڵو ترسناكدا ناژی؟ كۆمەڵگەیەك هەتا ئێستا ئەخلاقیاتی جاشایەتیو ئەخلاقیاتی

براکوژیو ئەخلاقیاتی ئەنفالچیەتیو ئەخلاقیاتی سیخوریەتی فایلداری تێیدا بەبرەو بێو ئاسایی بێ زۆر بە ئاسانی زەمینە تێیدا دەڕەخسێ بۆ داپۆشینو ڕێخۆشکردنو گەشەکردنی ئەخلاقیاتی ژنکوشتنو ژن بەکوشتدان.

هەروەها کۆمەڵگەیەك تا ئێستا کتێبو ڕۆژنامەگەریو میدیاو ڕەخنەو داهێنانی ژن تێیدا کەرەستەیەك بن لە کەرەستەکانی پڕوپاگەندەو دروشمەکاری نووسەرو ڕۆژنامەنووسو هونەرمەندو ژن یەك بن لە بابەتەکانی بەزەیی پێداهاتنەوەو سوك مامەڵە لەگەڵ کردنو سوك سەیرکردنێو بەهەند وەرنەگرتنی ناوو دەنگو تایبەتمەندیان لە پێکهاتەی ژیانو گۆڕانی کۆمەڵایەتیدا، بەپۆل کروشمەبوونی نووسەرو ڕۆشنبیران لەبن باڵی حیزبەکاندا، ژنەکانە بەرچاوەکانی هەر خەریکی دانوساندنێ بن لەسەر کورسیو دەسەڵاتو خۆ نەمایشکردنیان ئایا ڕۆشنبیرانو ژنانی لە قەیرانێکی ئەخلاقی قووڵدا ناژین؟

تێکەڵ بوونو تێکچڕژانی ئەو تاكو گرووپانە کەوتنە بەر دەستاڕو گەمەی حیزبایەتی ئەو چەند ساڵەی، دەکرێ یەك بێ لەو هۆکارە هەرە سەرەکییەکانی بۆ دروستبوونی قەیرانێکی ئەخلاقی چەقبەستوو، هەروەها قەیرانی ئەخلاقی ئەو دەمانە دەگاتە ترۆپكو گەشەکردنێ، کە پاش دەست سۆربوون بە شەڕی براکوژی دەستنانە خوێنی یەکتری بەهەموو شێوەیەكو بە جۆرەها بیانو دەستت بخەنە خوێنی ژنانو دەست بکەن بە ژنکوژیو قوربانییەکانی ژنکوژیش لە قوربانییەکانی براکوژی بێ سەرژمێرترو بزرتر بکرێن.

یەك لە دەرهاویشتە هەرە دیارو بەرچاوەکانی قەیرانی ئەخلاقی (کوشتن)ە کوشتنی ژن‌و هەتکردنی ژنان بەتایبەتی ئەوەی دەبێ لەبیرمان نەچێ‌و بەهەستیاری لێی بڕوانین، ئەوەیە کە نەتەوەی کورد بەدرێژایی مێژووی خۆی خودان کولتوورێکی پاك‌و جوان بووە ژن خودان پێگەی کۆمەلآیەتی‌و سیاسی جیاواز بووە لە گەلێك قۆناغی مێژوویی هەستیارداو ژنی کورد ژنێکی کامڵ‌و خۆڕاگرو ئازابووە چۆکی بۆ دوژمنانی خۆی دانەداوەو ڕێزی خۆی پاراستووە، پیاوی کوردیش ژن کوژنەبووە، جگە لە هەندێ حاڵەتی تاکدا کە لەناو هەندێك خێڵ‌و عەشیرەتی دواکەوتوودا ژن کوژراوە، لێ ئەو تەوژمە ژن کوژیەی ئێستا دەبینرێ‌و ئەو دڕندایەتییەی بەرامبەر ژن دەکرێ ئەنجامی ئەو ڕووداوو کارەسات‌و گۆڕانکاریانەی لەو بیست ساڵەی ڕابردوودا بۆتە هۆی گەڕەلاوژێیەکی ئەخلاقی سەمەرەو بە ئەنجامی کوشتن‌و هەتکردنی ژنان‌و نەمانی بەلآنسێك بۆ ژن بەو واتایەی یا دەبێ ژن بگەڕێتەوەو نمایشی ئەو دەورە بکا کە ڕەوتە ئیسلامیە توندڕەوەکان پێیان پەسەندە یا دەبێ ڕووی ئەو کاراکتەرە بنوێنێ کە جاڕدەرەکانی ئەو ئازادییە ساختەیەی بە ژنی خودان ماف‌و جەستەی ئازاد سەریان لە ژنان تێکداوە، ژنانیان بەپەلەپەل خستون بۆ بوونە ژنێکی ئازادی لە ژنانی ئەورووپی چوو بە روخسارو جەستە هەنگاوی بەپەلەی بۆ بهاوێن‌و لە ئەنجامیشدا تێدا بچن.

(ژن کوشتن) لە چەند جۆرێك پێك دێت‌و بەچەند شێوازو کەرەستان پیادەکرێت‌و چەندین مانا لەخۆدەگرێ، کە دیارترین‌و بەربلآوترینیان

کوشتن لەسەر شەرەفە، ژنکوژی لە هەموو دنیاداو لەو وڵاتانەی لە ترۆپکی دیموکراسیو ئازادیو سیستەمی یاسایی دانو ڕوودەدات، بەتایبەتیش لە وڵاتانی جیهانی سێو ڕۆژهەڵاتدا کە بەشێوازی دڕندەو زۆرجاران قوربانییەکانی بزردەکرێن یا لاشەکانیان فڕێ دەدەرێن، هەموو جارێکیش بکەرەکانیان نابینەرێنەوەو بە سزای خۆیان ناگەن، بەڵام لەولاتانی پێشکەوتوودا یاسا ئەوەندە بە تۆکمەیی پەلوپۆی وردی بۆ ژیانو پارێزگاری ژیانی ژنان، هاویشتوە سزای توندی داڕشتوە کە ئەو ڕووداوانە بە دەگمەن ڕوودەدەن، لەبۆیە خاڵی سەرەکی خەباتی ژنی کورد گۆڕینی یاساو داڕشتنی یاسای نوێیە.

دەگەڵ ئەو جیاوازییەی لەنێوان هەموو کولتوورەکانی دنیایەدا هەیە، لێ دەبینین ژنکوشتن لەسەر ئەو کردارانە ڕوودەدات کە ژن لە سنووره دیاریکراوەکانی پەیوەندی لەگەڵ پیاوو خێزاندا دەردەچێو ژیان بە دڵی خۆی هەڵدەبژێریو پێشێلی ئەو دابانە دەکات کە خێزانو پیاوان بە شەرەف ناوی دەنێنن، لێ ئەو ژنکوژییەی ئێستا لە کوردستان هەیە پەیوەندی قووڵی هەیە دەگەڵ بوونی ئەو تێکچرژانە سیاسیو ئەخلاقیە چەقبەستوەی ژیانی کوردی لێک هەڵوەشاندوەو داگیرکەرانی وەك ئەمریکا تۆڕو شانەی وردیان بۆ بڵاوکردۆتەوەو یەکە لەسیاسەتە نەبینراوەکانیان بۆ لێك هەڵوەشانی ژیانی ئەو کۆمەڵگایەی داگیری دەکەن.

ئەگەر ئاوڕێك لە مێژووی ژنکوشتن لە کۆمەڵگەی خۆمان بدەینەوە دەبێ لە کوشتنی ئەو ژنانەڕا دەست پێبکەین کە ڕژێمی بەعس بە

درندەیی پەلكێشی دەكردنە ناو پەیوەندی لەگەڵ پیــاوانی موخابــەراتو دەستڕۆیشتووی خۆیو بەلەشــفرۆش ناویــان دەڕۆیــی، پاشــان لــە لایــەن شۆڕشەوە دەكوژران، هەروەها پاش ڕاپــەرینیش كۆمــەڵێك ژن كــوژرانو بێسەروشوێن كرانو بە ژنــی ســومعە خــەراپ نــاوزەدكران، بەرەبــەرەش بەدرێژایی حەڤدە ساڵە ژن بە شێوازی نهێنیو ئاشكرا لە لایەن كەسانی دەستڕۆیشــتوو چــەكدارەوە كــوژراون ســوتێنراونو بــە ئــاویَ دادراون خنكێنراونو لووتو لێویان بڕدراونو هەتك كراون.

شیوازێكی دیكەی ژنكوشتن لە شەڕی نــاوخۆدا بــوو، كــە بــەجۆرەها بیانو ژن بوونە قوربانیو تۆمەتیان درانە پاڵو زیندانی كرانو پاشــانیش بە بزری كوژران، هەروەها خۆسوتاندنی ژنانیش كوشتنێكی گەرمــە كــە ژنان ناچار دەكــرێن بــە خۆكوشــتن بــە ئاگربەردانــە جەســتەی خۆیــانو خۆكوشتنیان.

شیوازێكی دی هەر لەناو شەڕی براكوژیدا بووە قوربانییــەكانی كیــژە گەریلاكان بوون كە لە چیایەكان یا لە شــەڕدا یــا لــەناو كەمینــدا یــا زۆرجاران بەدیلی دەكوژرانو شانازی بە كوشتنیانەوە دەكرا بە سەركەوتن ناوزەددەكرا.

هەتا پاش ئازادكردنی عێراق دەگەڵ دەستپێكردنی ئەو گۆڕانكارییــە گەورەو چڕانەی لە ژیانی كۆمەڵایەتیدا ڕوویداو تەكنۆلۆژیا بەشێوەیەكی بەربلاو بەبێ یاسایی ژیانی خەڵكی داپۆشی بەتایبەت مۆبایل، ژن بــوو بــە گــەورەترین قوربانییــەكانی ئــەو گۆڕانكاریــەو تــەكنۆلۆژیا بووەتــە كەرەستەیەك بۆ هــەتكردنی ژنو بەكوشــتدانی، كــە گەیشــتە قۆنــاغی

دڕندایەتی ئەویش ئەو شێوەیەی کە دۆعای کیژە یەزیدی پێ بەردەبارانو شەهیدکرا.

ئەگەر ورد سەرنجێ بدەین هەست دەکەین بەگەشەسەندنی لەشکڕینو لەشفرۆشتنو لەشکوشتن لە یەك کاتدا زۆربەی پیاوە لەشکڕەکانن دەبنە لەشکوژو دەست دەخەنە خوێنی ژنان بە جۆرەها شێواز، دەستنانە خوێنی ژنانیش هەند شێوازی هەیە کە لێرەدا زۆر بە چڕی ناچمە ناویان، تەنها بە سەرنجێك تێیدەڕوانینو دەبینین هەندەك دەمان کوشتنی ژن هەر ئەوە نییە ژن گیانی لەدەستداو بمرێ، شێوازگەلێکی دیکەی کوشتن هەنە وەکو ژنە شەهیدەکانو ژنانی پاشماوەی ئەنفالو هەڵەبجەو ژنە بێ دەرامەتەکانی بە کوێرەوەری کەوتوونەتە پەراوێزی کۆمەڵگەو لەوێرا لە زۆربەی ژنە دەمگەرمو مشەخۆرەکان دەڕوانن، کە بەناوی ئەوانەوە سواڵی ئازادیو یەکسانی دەکەنو ڕێکخراوو سەنتەرەکانیان لەدەرەوەو لەناوەوە پێ بەڕێوەدەبەنو بازرگانی بەخوێنو ناویانەوە دەکەن.

هەروەها شێوازێکی دیکەی کوشتنێ بەهۆی تەکنۆلۆژیاوەیەوەو تۆقاندنی ژنان بەهۆی تۆمارکردنی وێنەو دەنگیانو هەڕەشەکردن بە بڵاوکردنەوەیو دەستەمۆکردنیان بۆ مەرامی گڵاوی بکوژەکانە.

دەبێ ژنان خەباتی ڕاستەقینە بکەن بۆ گۆڕینی یاساکانی باری کەسیو داڕشتنی یاسای نوێ، کە خەباتی زۆرو قوربانی زۆری پێدەوێ، ئەوەش دۆخی سیاسی لەبارو کەسانی لەخۆبردووی پێویستە، چونکە پێشێلکاری بەرامبەر ژیانی ژنان گەیوەتە لوتکە وەك دەبینین وێنەگرتنی کوشتنەکانو بڵاوبوونەوەیان، یا وێنەگرتنی هەتککردنی ژنان بە مۆبایل

بۆتە مۆدەیەك، بكوژەكان كاری لەسەر دەكەن، پلانێكـە لـە پلانـەكانی تۆقاندنی ژنانو دەستبەسەركردنیان.

لەبۆیە دەبیٚ بەتـەنها ئامـاژە بـە كوشـتنی ژنـان نەكـەین، زۆر بـە وریاییەوە ئاگامان لە بەكوشدانی ژنانیش هەبیٚ كە خەتەرێكی گەورەیـە بۆ سەر ژنانو یـەك لەدەرهاویشـتە دیارەكـانی گـەڕەلاوژێی ئـەخلاقیو گۆڕانی كولتووریە، ژنی كورد ئێستا لە هەسـتیارترین قۆنـاخی ژیـانی دایە لەئەنجامی ئەو گۆڕانە كولتووریە، بۆیە دەبیٚ هێندە هۆشیار بن كە چۆن مامەڵە لەگەڵ كولتووری خۆو تەكنۆلۆژیاو ئازادی بكەن، نـەوەكو سەرەڕای نەخوێندەواریو نەهامەتی خۆیـان هانبـدرێن بـۆ دروشمـەكانی ئازادی جەسـتەو یەكسـانی لەگـەڵ پیـاوانو ژنـان هۆشـیار بكرێنـەوە بەرامبـەر ئـەو چـەكە بێدەنگانـەی بـە كوشـتنیان دەداتو دەیانكاتـە قوربانی، كە مۆبایل یەكەمیانە.

گەڕەلاوژەی ئەخلاقی ئەو دەمانە رەگی دەهاویٚ كە ماناكانی ئـەخلاق دەشێوێنو كوشتنو بەكوشتدان لێـك جیاناكرێنـەوەو نـەمانی ئـەخلاقی دەبتە ئەخلاقو لەشكرەكان دەست دەكەن بەكوشتنی ژنانو خەڵك توشـی سەرلێشێوانێكی ئەخلاقی دەبیٚو هەركەسو هـەر گـرووپو رێكخـراوو حیزبێك لەبەر خۆیـەوە پێنـاسو بۆچـوونێكی لەسـەر ئـەخلاق دەبـیٚو، ژنانیش تێیدا دەبنە قوربانیو بە كوشت دەچن.

ئەو دەمەی ژنان نـازانن كێهـە ئـەخلاق ڕەچـاوكەنو كێهـە ئـەخلاق دروستە ئەو ئەخلاقیاتەی زۆربەی ژنانی خۆ بەفێمینیستزانو ئازاد جاڕی بۆ دەدەن یا ئەو ئەخلاقیاتەی خێزانو كولتووری سەركوتكەری لەپاشە یا

ئـەو ئەخلاقیاتـەی دەزگـاو دامـەزراوە مەدەنییـەکانی دایانڕشـتوە بـۆ کـارکردنو بەرەوپێشچـوونو پێگەیانـدنی ژنانـە لـە ژیـانی سیاسـیو کۆمەلایەتیدا، ئەوا بە هەڕەمەکی مل دەنێن تا وەکو دەوروبەر بە ژنێکی مودێرنیان وەسف بکاو ئەنجامیش دەسکەوتێك وەدەست بێـنن، دەکەونـە هەلدێرێكو تێیدا دەبنە قوربانیو بە هەتککردنو بە کوشت دەدرێن.

❊ بۆ هەر کەسێك دەیەوێ زیاتر زانیاری بەدەست بێنێ لەسەر کوشـتنی ژنـان لە زۆربەی ولاتانی دنیادا ئەوا دەتوانن لەسەر سایتی گۆگل ئەو ناونیشانو لینکانە بنووسن:

❊Women honour killings

❊ stop honour killings

❊ WNN_ Women news Network

❊ Women's News

❊ Amnesty international

❊ Human Right council

* جێی ئاماژەیە ئەڤ وتارە درێژەی ئـەو بابـەتو باسـانەیە، کـە لەسـەر ئـەو گـەڕەلاوژێی سیاسـیی لـە کوردسـتاندا دەگـوزەرێ دەینووسـم، بەشـی یەکـەمی بلاوکراوەتەوە.

**مەسعود محەمەد**

# ئەو هزرڤانەی هەتاهەتایە جێی پڕ نابێتەوە

## ( نرخاندنی ڕۆشنفکران شەرەفەو ئەرکێکی نیشتمانییە )

هەڵکەوتنی کەسایەتیو ڕۆشنبیری سەنگین زۆر بەدەگمەن ڕێدەکەوێ بەتایبەت لەنێو نەتەوەیەکی هەڵپەسێردراوی وەکو ئێمەدا، کە هەر رۆژەی بەدەنگی زوڕنایەك هەڵپەڕیوینو بەقسەی دوژمنێك کەوتوینەتە هەلەکەسەماو بەکۆلکە ئایدۆلۆژیایەك تەواو ئاوەژوو بووینەوەو پێمان وابووە کەس نامانگاتیو هەر بەرەوە بەدووی شۆڕشو شکەستو هەر کوێخایەك کەوتووینو دەکەوینو قەتیش دەستمان بە فیکرو خوێنو رەسەنایەتی خۆوە نەگرتوەو ناشگرین.

ئەز زۆرم پێ گرنگە رۆشنبیری سەنگین بێ، رۆشنبیری سەنگینیش حەتمەن ژیانیشی سەنگینەو دەبێتو بە سەنگینی بژیو بمرێ بە پێچەوانەی ئەو نووسەرەی لەبەرهەمەکانیدا پەلوپۆ بۆ زۆر بواران داوێنو لێ ژیانی راستەقینەی خۆی پڕە لەپینەو سازشو چاڵ وچۆڵی ناوو ناوبانگو گەیشتن بە دەسەلات، لەنێو مێژووی هەموو نەتەوەیەکدا رۆشنبیرانێکی هەڵکەوتە هەن کە هاوسەنگیان وەها لەگەڵ مێژوو

هاوسەنگە کە نە بەتێپەڕبوونی زەمەن و نە بەدەسەلاتی سیاسیی و نە بەگۆڕانی کۆمەڵگەو شەپۆلە فیکریی و ئایدۆلۆژییەکان تێك ناچێ و لاسەنگ نابێت. هەمیشە لە ترۆپکدان... ڕۆشنبیر دەبێت خاك و زمانی خۆی زۆر خۆشبوێت و زۆر بە هەستیاری قەڵەم و فیکری ببزێوی ئەوجا دەتوانێ نەتەوەی خۆی خۆشبوێت و بە هەموو قومە ئاوێك نەکەوێتە هەڵکەسەماو زمانگۆڕکێ و بیرگۆڕکێ عەودالی ناووناوبانگ و دەسەلات بێت..

چەند پێم شەرمە کە لە کوردستانێکی گەورەو پایتەختێکی کوردان، کە هەولێرەو لەو سلێمانییەی بە پایتەختی ڕۆشنبیری نێوزەدکراوە نەکتێبخانەیەك نەکتێب فرۆشییەکی نەکولتووری نەشارستانی وەبەرچاو دەکەوێ! کە هێماو نیشانەی ئەوە بێت ئەو نەتەوەیە دەزانێ کتێب چییەو خودانی پیاوانێك بووە ژیانی بەخشیوەتە کتێب! ئەگەر هەر یەکێك سەردانن بکا دڵنیام یەکەم شت سەرنجی دەداتێ ئەوەیە وا هەستدەکات هەموو پێکهاتەی ڕۆشنبیری ئەو ولاتە بەتەنها ئەو بینا قوتکردنەوەیە، ئەو بینا شوشەبەندو بێ ڕەنگ و بێ ڕوحانەی سڕت دەکەن و هەست دەکەی دوو ساڵی دی وا بڕوا خەڵکی کوردستان مەڕمەڕو شوشە لەجەستەی خۆشیان دەگرن و شانازی بە پێشکەوتن و بەدوبەی ئیمارات چوونیان دەکەن و بە بارانیش کتێب لەو دووسێ کتێبفرۆشییەکەی بن قەلاتێدا لەسەریەك ڕۆنراون یا لەبنەبانی هەر دائیرەو دەزگەیاندا کەڵەکە کراون! لەهەر لا کۆلانەش دەزگای چاپ و دەزگای وەرگێڕان و دەزگا هەڵدەتۆقن و دەکرێنەوەو بەبایی پیلانیش

حەیبەلۆك سازدەدرێن بەناوی ڤیستیڤاڵو پەیكەر بە ڕادان دەدرێن‌و هەڵدەوەشێنرێنەوە.

دەبێت هەموو دان بەوەدا بنێین كە ئێستا ئێمەی كورد لە قۆناغێكدا دەژین كە قۆناغی بە هەدەردان‌و قۆناغی لەخۆدەرچوون‌و قۆناغی نەدی بدیایەتییەو قۆناغی خۆلەبیركردنە، دەبێ پێمان ئاسایی بێت كە لەپڕ زۆر كەس‌و دیاردەی سەیر لەناو هەموو كایەكانی ژیانی كوردیدا هەڵدەتۆقن‌و بەكەیفی خۆو بەنەكاملی خۆ پێپركە لەناو مێژووو جوگرافیاو زمانی نەتەوەی كورد دەكەن‌و بە مۆدێلی سەیرسەیر مێژووو جوگرافی زمان‌و فیكر دەبزێون‌و هەمووی لێمان روونە ئەوڕۆ چۆن بە چاونەپشكەوتوویی لە دنیاو شارستانیەتی گەلان هەڵدەڕوانین دڵنیایین كە هیچیمان لەسەر هیچ نییەو ئەوەی هەشە بەسەریدا بازدەدەین‌و دەشێوێنین.

هەموو نەتەوەیەك پیاوو رۆشنبیرانێكی هەڵكەوتووی هەن كە هاوسەنگیان لەگەڵ مێژووی ئەو نەتەوەیە وا هاوسەنگ بووە نەبە تێپەڕبووی زەمەن‌و نەبە گۆڕینی دەسەلاتی سیاسی و نەبە گۆڕانی كۆمەڵگەو شەپۆلی ئایدۆلۆژی پیگەیان لاسەنگ نابێ‌و تێك ناچێ وێنەیان كاڵ نابێتەوە، بۆیە منیش بە پێویستی دەزانم سەرنج بخەمە سەر یەك لە كەسایەتییە دیارو رۆشنبیرو بیرمەندە سەنگینەكانی كورد كە دوژمنانی كوردیش مەجبور بون دان بە شارەزاییی‌و عاقڵی ئەو رۆشنبیرەدا بنێن.

ئەوەی بڕەك دڵـم پێخۆشـە ئێمـەش وەكـو نەتەوەیـەك خـودان ئـەو ڕۆشنبیرە گەورەین كە دەكرێ بە تەرازووی فیكر تاریفی بكـەین، چـونكە بەدرێژایی تەمەنی توانیویەتی زمانو فیكری دەگـەڵ كەسـایەتی خـۆی هاوسەنگ ڕابگرێ ئەویش "مامۆستا مەسعود محەمەد"ە ئەو بیرمەندەی بۆ هەمیشە زمانو فیكری كورد قەرزداریەتیو نابێ جێگـەو نـاوی لـە بزاوی ڕۆشنبیری كوردی درزی تێكەوێو خاڵی بمێنێتەوە... حەتمەن لێـرەدا نامەوێت بە قووڵی روبچمە سەر تاریف كردنو نرخاندنی ڕۆڵی مامۆستا (مەسعود محەمەد) بەتەواوی، چونكە لەسەر نووسینو قەڵەمو بزاوتن بـۆ بەسەركردنەوەی ئەو ڕۆشنبیرە وتارگەلێكی قووڵو زمانێكی تۆكمـەو پـڕ لەمانای پێـدەوێت، لـێ ئـەوەی جێـی سـەرنجە ئـەو هەسـتكردن بـەو بۆشاییەی كە خەریكە دەكەوێتە مابـەینی ئـەو ڕۆشـنبیرەو ئـەو نـەوەی سەرقاڵی نووسینو خوێندنەوەیەو هەروەها ئەو كتێب فرۆشـانەی پڕبـوون لەكتێبـی بازرگانیو ئەو ناوەندە ئەدەبیو ڕۆشنبیریانەی كـە نـوقمی بـە بازرگانی ببوونو ئەو هەلاهەلابوونەی كایەی فیكری كوردی تێیدا دەژی، بۆیـە هەسـت بەترسـێك دەكـەم، جێـی سەرنجیشـە بـەر لـەمن چـەند نووسەرێكی دی بەچەند وتاری چڕ ئاماژەو تیشـكیان هاویشـتۆتە سـەر ڕۆڵی فیكریو دانسقەییو فەرامۆشكردنی مامۆستا مەسعود محەمەد.

ئەز كەیفخۆشم كە نەتەوەی كورد خـودان ڕۆشـنبیرێكی ئاسـتبەرزە، لێ زۆریش دڵشكاوم، كـە دەبیـنم جێگـاو پێگەیـەكی دیـاریكراوی بـۆ تەرخان نەكراوە، دوو ساڵ بەری ویستم هەندێك لە بەرهەمەكانی بكـڕمو لەلای خۆم بیپارێزم، لێ كە دەچوومە هەر كتێب فرۆشیەك هەنـدێكیان

هەر نەیاندەزانی مەبەستم کێیەو کتێبەکانی تاقو تەرا نەبێ وەدەست نەدەکەوتن.

لەبۆیە ئەز زۆر هەست بە شەرمێکی قوولّ دەکەم کە بەرهەمی مامۆستا بەرەو بزربوون بچیٚو نەوەی داهاتوو ئاگایەکی لەو بەرهەمانە نەبێت، لەبەر هەندێ دوای ئەو ژانە قوولّە بەپێویستم زانی هەندێك پێشنیار بخەمە بەردەست لایەنی پەیوەندیداری دەزگەی ئاراس، بەم شێوەیە ئومێدێ دەکەم هەنگاو بە هەنگاو بێنە جێبەجێ کردنێ:

بۆ پتر خۆشویستنی نەتەوە، دەبێ پتر رۆبچینە ناو هەلّچنینی مێژووی خۆیانو بەدیاریکردنی جێ پەنجەو فیکری رۆشنفکرانی کورد کە یەك لەوان مامۆستا مەسعود محەمەدە، کە جێی فیکرو زمانی هەندە دانسقەیە پێویست دەکا پڕ بەدانسقەیی خۆی پیگەیەکی سەنگینی لەبۆ بنیاد بنرێ لەبەر هەندیش من پێشنیار دەکەم:

١ دروستکردنی پەیکەرێکی شایستە بۆ مامۆستا مەسعود مەحەمەد

٢ لەچاپدانەوەی تێکڕای بەرهەمەکانی

٣ چاپکردنی هەموو دەسنووسەکانی

٤ ناونانی کتێبخانەیەکی گەورە بەناوی

ئەز ئەڤ دەستنیشانکردنە بەئەرکێکی نەتەوەیی دەزانمو هیواش دەکەم هەموو کوردێك بەئەرکێکی نەتەوەیی بزانیتن بۆ خزمەتی نەتەوەی کورد.

# ژن و داهێنان

**ڕامان: لەمێژە ئافرەت لە ئەورووپا ئازادە، بەڵام بەداخـەوە لـە بـواری شیعریدا وەك پیاو ناوی درەوشاوە نییە، هەر بۆنموونـە زۆربـەی تەکانـە شیعریەکان لە ئەورووپا پیاو ئەنجامی داوە؟**

ئەمن گەلێك پێناسم، هەن ژن لەبۆ ئەو سیحرە جوانانەی کە لە نێـو خانەکانی لەشی دا هەن، لەبۆ ڕایەڵی ئەو دەزولانەی لە ڕوحیدا هـەن.. لەبۆ ئەو خڕۆکەسورانەی خوێنی دروست دەکەن. بۆیـە دەڵـێم (ژن ئـەو دورگە جوانەیە کەنارە تەڕەکانی پڕن لە پەپوولەو گوڵ).

ژن ئەو بارانە جوانەیە بەسەر ڕۆحی هەر مرۆڤێکدا ببارێـت تێـراوی دەکا، ژن ئەو دەریا مەندەی شەپۆلە هێورەکـانی پیـاوی تێـدا دروسـت دەبن. لەنێو هەموو ژانرەکانی ئەدەبدا شیعر لە هەمووان خۆڕسکترە، بـە چێژترە، بە کەفو کوڵترە. لەنێو هەناوی هەموو بوونیشدا ژن لە هەموو شتێك تەڕترە، ڕوونترە، پڕ گوڵو بە شەپۆلترە..

بۆیە دەڵێم هەموو وشەکانی شیعر دەگەڵ ژن وێك دەچن داڕشـتنیان گەلێك سەختە.

مەسـەلەی ئـازادیو ئـافرەت هێنـدە چـڕو پـڕە، لـەوە قـووڵترە لـە پرسیارێکدا ڕۆبچینە نێوی، بە ڕوحی ئەو کەسەوە بەندە چ لێرە بێ چ لە

ئەوروپا، چونکە نە ئەوروپا مرۆڤ فێرە ئـازادی دەکـا نـە ئێـرەش مـرۆڤ زیندانی دەکا.

ئێوە دەڵێن لەمێـژە ئـافرەت لـە ئـەوروپا ئـازادە، دەبێـت ئـەوروپا زیندانێکی لە شوشە بێت لەبۆ ئافرەت. بۆیە لە بواری داهێنانی شیعری ناوی درەوشاوە نییە، ڕەنگە ئێمە لێرەدا بە ئازادی ببینین با زیندانەکـە شیشەی پێوە نەبێت با تاریـك نـەبێت، ئـەوە زۆر بـەرین و فـرە ڕەگـەزە سالاریەتێك بۆتە تۆزو بە ڕوی پێشکەوتووترین شارستانیەتەوە نیشتووە.

پیاوسـالاری بۆیـەکی فسـفۆریە لـە ڕووی مەدەنیـەتی هەڵدەسـون، بەرامبەر بە ئافرەتدا بە ڕووی کۆمەڵگەوە چەسپیوە، گەلێك بە سەختی ئافرەت دەتوانی ببێتـە نـاوو تەکانبـەر چ لـە بـواری ئـەدەب بـێ یـان سیاسەت.

دەڵێن تەکانە شیعرەییەکان لە ئەوروپا پیاو دروستی کردووە، دەکرێ بڵێین لەوێندەریش پیاو هەر سالاریەت لە خزمەتیدایـە، چـەکێکی بـێ دەنگە دەتوانی زۆر شتی پێ بکات، گەلەك ژنی بەئـەزمون و هەڵکەوتـە هەنە کە بوونەتە خاوەن خەڵاتی نۆبڵ و لەنێو گەلانی ئەوروپاشدا ناسراوو شایستەن، بەڵام دەبێ خوێنەری کورد پێیان ئاشنا نەبێ یا بەرهـەمییان نەگیشتبێتە دەست خوێنەری کورد.

ئەوە هێندە قووڵە دەتوانم بڵێم ئازادترین ئـافرەتی ئـەوروپیش ئـازاد نییە، ئەگەر کەلەپچەش لە دەسـتی دەرهاتبـێ جێگەکـەی بەڕوحیـەوە دیارە، ئەگەر بنۆڕینە تەکانە ئەدەبییەکان لـە ئـەوروپاو دەوروبەریشـدا دڵنیـام ئـەو مرۆڤانـەی گەیشـتوونەتە دوورگـەی ژن، ئـەوجا لەوێـدا

شەپۆلی داهێنەریان داوە وەکو (شادور دالی، مارکیزو بیکاسۆو پاز نزار قەبانی)

رۆشنبیری کورد تا ئێستاش بە تۆکمەیی نەگەیشتووتە ژن، بۆیە داهێنانی گەورەمان سڕە یا هەر نییە، شاعیری کورد رۆماننووسی کورد ئاوازدانەری کورد ژن ناناسی واوەتر لە پەیکەرێك لە برێك رۆمانسیەت لە جنسو حەوا زیاتر تێڕوانینێکی دیکەی نییە بۆی قووڵ نەبۆتەوە نێو ژن، هەر شاعیرێك هەر سیاسییەك هەر مۆسیقاژەنێك هەر نیگارکێشێك گەیشتە دوورگەی ژن دەتوانی لەوڕا هەموو دنیا ببینیو گەورەترین داهێنان بخوڵقێنی، لەبۆیە دەکرێ بڵێین هەموو ژنانی مێرددارو بێ مێرد، بێ مێردنو بێ بەرین لە پیاو، ژن هەیە خاوەنی دە منداڵەو نابینم مێردی کردبێ بە پێچەوانەشەوە پیاو بە ژندارو بێ ژنەوە بێ ژنن، هەر ڕەبەنەو بە قەیرەیی دەژی (مەسەلەو گفتوگۆی نییە لەگەڵ ژن) پیاوان نەیانتوانیوە کۆترەکانی لە لەشی ژنێك هەڵفڕێننو ماسیەك لە دەریاکانیدا دەربهێننو نەیخنکێنن، ژنیش هەتا ئێستێ نەیتوانیوە بەو پانتاییە مەعریفیە بگاتە پیاو، تەنها لە ڕووی جەستەو سالاریەك ناسیویەتی، زۆربەی پیاوی کورد زۆر بە منداڵی لە باوەشی دایکی دادەبڕێت، ئەوە کارەساتە لەو پەرتەوازەییە ڕا دەڕوانیتە ژن، هەروەها ژنی کوردیش لە کلاورۆژنەی سالاریەت ڕا پیاوی لێوە دیارکەوتوەو ناسیوە.

**ڕامان: چ لەسەردەمی بابا تـاهیرو چ لەســەردەمی مــەلای جزیــری‌و نالی‌و هەروەهاچ لەسەردەمی گۆران وڕوانگەو تەلیعیەت وفۆرمی گران‌و وێران‌و زناك‌و ...ناوی ئافرەتێكی شاعیر وەكو تەكانبەر نیە بۆ؟**

هەتا ئێســتیَ ژنــی كــورد ئەگــەر نووســیویەتی‌و وەدەركــەوتووە لــە گوتاری فیمنیزم تێنەگەیشــتووە، مێینەییەكــەی خــۆی حەشــار دەدات‌و دەڕوات بەهێزێكی پیاوانە بچیتە پێشــەوە، ئــەو حاڵەتــە داهێنــانی ژن دەكوژێت‌و بەرەو كەوتنی دەبات، ئەو مەســەلە نیشــانەی ژنــان گــەلێك قووڵە قووڵترە لەوەی ژنێك تەنها ئەوەی لێــی زەوت كــراوە دەبــێ باســی بكــاو بــۆی بنووســیَ. زۆر بــە ڕووكەشــی لــە پیــاوو لــە مەســەلە سێكسییەكان‌و لە دایكایەتی تێدەگەن‌و ئــەوە ئــەو خەتەرەیــە، كاتێــك قەڵەمیش بە دەستەوە دەگریَ‌و مێیاتییەكەی هەر لــیَ جــودا نابێتــەوە، چونكە روحی پەیوەستە بەو پێوانانەی كە شــەرەف‌و مەزهــەب‌و نــەریت دایڕشتون، سانســۆرە كۆمەڵایــەتی‌و كولتووریــەكان وەكــو ســێبەرێكن بەسەر بەرهەمی ژنــەوە، (دەبێــت لــە ســەردەمی ڕوانگــەو تەلیعــەت‌و فۆرمی گران‌و وێرانیشدا ژن هەبووبن، بەڵام بــۆ ونــن؟ گەوهــەری ئــەو كێشەیە نەژنان لەبۆ خۆیان دەزانن چییەو دەبیَ چی بۆ بكەن، نەپیاویش تا ئێستیَ بەو ڕوونیە هەرسی كردووە.

ژنی سەركەوتوو ئەوە نییە سەنگەر دژی پیاو بنێتەوەو، لــە هــەموو پەیوەندییەكانیدا ململانیَ دروست بكا پێش ئەوەی وەكو ژن ڕۆچێتە نێو مەسەلەكان، دەبێت وەكو مرۆڤ تەماشای خۆی‌و هەموو ئــەو بنەمایانــە

بکا، کە یاساو ڕێساو ئەخلاقی ئەو کۆمەڵگەیەی لەسەر بنیادنراوەو، ئەو مێینە ڕەهایەی تێگەیشتووە زوو دەکەوێ..!

ئاسمانو درەختو گلاّو گوڵو بارانیشیان وا ڕایهێناوە سالاریەت بە ڕووی ژندا بنوێنن، لەو سەردەمانەی باستان کردووە کە بۆ ناوی ئافرەتێك نییە، ئەو سەردەمانە لە بۆ ئافرەتی کورد هێندە تاریك بوون دەبێت ناویان بنێین سەردەمی خەفە بوونو خنکان، دەگەڵ ئەوەشدا هەر هەبووە بۆ نموونە (مەستورە کوردستانی) ئافرەتێکی شاعیرو شارەزای سەردەمی خۆی بووە، بەلاّم نازانم بۆ ناویان نەهاتۆتە نێو مێژووەو بە ڕوونیو دایانپۆشیون دەبێت هی دیکەش هەبووبێ، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ کەوتنەکەی کە لە پرسیارەکەی دیکەدا باستان کردبوو هەبووەو کەواندویانە!

بواریان نەدایتێ باس لە خۆی بکا، داهێنان لە هەموو شتێك پتر ئازادی پێ دەوێ، ئافرەتێك کە پیاو دەسەلاّت بووە بەسەریەوە مێژوو دەسەلاّت بووە سیاسەت دەسەلاّت بووە دین دەسەلاّت بووە چۆن ناوی لە مێژوودا دەنووسرێتو، دەبێت باباتاهیر گەیشتبیتە ئەو دوورگەیە یا ئاقاری؟ بۆیە بوویتە باباتاهیر.. هەروەها ئەحمەدی خانیو نالی بە پێی سەردەمی خۆیان گەیشتوونەتە شەپۆلێك لە ژن توانیویانە داهێنان دروست بکەن.

ئەگەر ژنیش ئەودەمی وەکی وان توانیبایو ڕێگەی بۆ خۆش کرابا لە جوانییەکانی پیاو قووڵ ببێتەوەو بگاتە حەقیقەت، حەتمەن شتی گەورەتری دەکردو دەبوو بە ناوو تەکانبەر. ئەودەمەی رۆشنبیری کورد

گەیشتە قۆناغێکی بەرز ئەوەدەمی دەتوانێ ئافرەت وا پەروەردە بێت تەکان بداتە هەموو پەیوەندییەکان نەك هەر شیعر، بە چاوێکی نوێ لە دنیاو شیعر بڕوانێو ئەوانەی دەیەوێن پێویست وەدەستیان بهێنێتو خزمەتی مێژوو داهاتووی ئەدەبو سیاسەتو هونەری کوردی.

**ڕامان: پیاو لەئافرەت جوانترە وەك چۆن کەڵەباب لە مریشك جوانترە، هەر ئەو جیاوازیەشە بووەتەهۆی ئەوەی کە پیاوی شاعیر لەئافرەتی شاعیر لەبواری شیعر نووسیندا داهێنەرتربێ؟**

شیعر جوانە، بەڵام ژن لە شیعر جوانترە پڕ خەسڵەتترە پڕ ماناترە جوانی لەکنە من هێندە بەرینە ناتوانم بڵێم پیاو لە ئافرەت جوانترە یا ئافرەت لە پیاو جوانترە، جیاوازی لە نێوان جوانییەکاندا نابینم دروستکردنی جوانی نەبە هەموو پیاوێك دەکرێت نە بە هەموو ژنێکیش.

ئەوەی بتوانێ دروستی بکا. گەورەترین داهێنانە چ پیاو بێ یا ژن.

ئێوە دەڵێن پیاو لە ژن جوانترە بۆیە لە ژن داهێنەرترە! وا بزانم ئێوە دەتانەوێ بەو هاوکێشەیە لە پرسیارەکاندا هاتووە جارێکی دی سەروەریەکانی پیاو بسەپێنن بەوەی پیاو لە ژن جوانترەو عاشقترەو داهێنەرترە.. لە بواری شیعردا ئەوە هەرگیز نابێتە پێوەر، ڕاستە پیاو خاوەنی زۆر جوانی گەورەیە کە ژن لە کۆمەڵگەی ئێمەدا نە پیرۆزبوونەو نازانێ بەکاریان بهێنێ، بەڵام نازانم بۆ دەڵێن لە ژن جوانترە. پیاوی شاعیر پێ دەگاتە جوانیەکەی ژن، ڕێیەکە بۆ وی ساناترەو دەتوانی بە ئاقاری داهێناندا بڕوات، ئەوەتا چەند نووسەری ناوداری وەکو غادە السمانو د.

نوال السعداويء  فاطمة المرنيس کـه لـەنێو پیاوانـدا وێنـەیان کەمـە، حەتمەن سەردەمی ژن سالاری هاوکێشەکە بـە پێچـەوانەوە بـووە، بۆیـە دەڵێن ((ئافرەت هەر پاشکۆو زەعیفەیە)) پیاو هەر پێشڕەوو داهێنەرە! دەڵێن پیاو جوانترە بۆیە داهێنەرترە، مارکس ناشیرین بووە کە ئەو کەڵـە مرۆڤەی لێ دروست بووەو  شیعریشی نووسیوە، ئەوی ئـەو لـە جیهـانی ئەدەبو هونەرو جوانکاری گەیشتووە کـە نـە شـاعیران تێیگەیشـتون، ئەگەر مەسەلە ئەو جوانییە ڕوکەشەبێ کە دەڵێن کەڵەباب لە مریشـك جوانترە، ڕەنگە پیاو جوانییەکانی بەتین تر بن، ئەمما سالاریەتەکە تێکـی شڵەقاندوە زۆر شتی بێ بەهای لێ بوونە بە بەهاو، بێ بەهایەکانیش لێ زەوت کرایە، دەبێت ئـەو وەکـو شـارلوت برۆنتـێ بڕوانیتـە ژن یـان ژن بیەوێت خۆی وەکی ئەو ژنە لێ بکا کە شارلوت دەڵێت (وەکـو ئـافرەت بـیرم لــێ مەکەنــەوە) ژن لەکنــەمن گوڵــە، نــەدەکڕدرێ نــەدەدزرێ، نەدەفرۆشرێو نەدەگۆڕدرێ تەنها دەڕوێنرێ.

ئافرەت دزینم پێ خۆش نیە، ژن لەوە گەورەترە بدزرێ لەوە گـەورەترە بفرۆشرێ لەوە گەورەترە داگیر کرێ.

ڕامـان: هەیە دەڵێ: پرۆمسیپسێکی ئافرەت دزە، بۆیە لەکاری شیعر نووسیندا درەنگ دەکەوێ، دەبێ ئافرەتیش ببێتە پرۆمسیۆسێکی ئاگردز تا ئەویش لەکاری شیعرنووسیندا زوو نەکەوێ؟

ژن زۆر شت لە خۆ دەگرێ پێویسـت ناکـات ببێتـە پرۆمسیۆسـێکی پیاودز، نا ئەویش لە شیعر نووسیندا زوو نەکەوێ ئەگەر لێـی گـەڕێن دەیـەوێت پیـاو بـە پیرۆزیـەوە بێنێتـە نێـو شـیعرو زووش ناکـەوێ..

مەسەلەکە ئەوەیە ژن دەیەوێ پیاو لە جوانییەکانی خۆی هەڵکێشێ، ئەوددەمی دەبێتە تەکاندەرو ناکەوێ (ئەوە بۆ ئێستای ژنی کورد زۆر زەحمەتە، بۆیە دەبینین نیوەی لێ کەوتووە!

پیاو درەنگ دەکەوێ لەوانەیە پیاو هەبێ سی ساڵە دەنووسیو خۆی پێ نەکەوتووەو، کەچی جوانی نەکردووەو نەوتووە! ئەگەر سالاریەتەکان لە ئافرەت گەڕێن‌و پلان لە بۆ کەوتنی دانەڕێژن، ئەگەر پیاوێك درەنگ بکەوێ یان بە سەختی، ئەوا ئەو هەرگیز ناکەوێ.. جودا لەوەی کە بۆ خۆم لەو ڕەگەزەم ژن بوون ئەو نیعمەتە گەورەیەیە، هەموو مرۆڤێکی مێینە وەگیری ناهێنێ.

هەر پیاوێك یا هەر ژنێك هەموو شتەکانی لەسەر ئازادی تەواو جوانی تەواو ڕۆنا، دوای مردنیش ناکەوێ دەگاتە لوتکە. شیعرنووسیش لە بۆ ئافرەت ئەرکێکی گەلێك سەختە بە دەستەوەگرتنی پشکۆیەك لە گڕە، دەبێت وا دەستی داتێ دنیا ڕووناك بکاتەوە دەستیشی نەسووتێنێ.. ئازادیش هەر وایە لە بۆ ئافرەت ئەوە مەسەلەیەکی جیهانیە، هەر لێرە ئەوە دروست نەبووە زۆر جودایە لەو یاسایەی ئێوە لە نێو پرسیارەکەتاندا داتانڕشتووە.

من جیهانی شیعر لەوە پاکترو فراوانتر دەبینم، تەنیا بریتی بێ لە جیهانی پرۆمسیپسێکی ئاگردز یا ڕووناکی دز یا ئافرەت دز. سروشت بەختی سەرچاوەی شیعری پیاوانەبێ، هەموو گەورە شاعیرانی جیهان مەرج نەبووە ئەو ئافرەت دزە بووبوون. بەڵام هەر ئافرەت‌و پیاو سروش‌و

**سەرچاوە نین، ئەدی خاكو نیشتمانو مەسەلە پیرۆزەكانی دیش؟ ئەوە ڕێژەییيیە زۆر لە دنیاپاكەكەی شیعردا.**

## شیعری ئازادو ژنی ئازاد

ئەو دەمەی هەست بە کارەسات و هەژەندێکی ترسناك دەکەی کە زۆربەی کاوێژو ورێنەو پێپرکە لەناو وشەو مانادا بە شیعری ئازاد ناودەنەرێن و ژنە چەوساوەکان داوای ماف و ئازادی لە بۆ ژنانی کۆمەڵگاکەت بکەن و سیاسییەکان سنوور بۆ نووسەرو رۆژنامەنووسەکان دیاریکەن و شاعیرەکان حیزب ڕایانیو ژنان هەر چاویان لە دوی ئەو ئازادیە بێ کە پیاوان پێیان دەبەخشن و هەموو تێکڕا یەك زمان و یەك پێناسەیان هەبێ بۆ سیاسەت و ئەدەب و مێژوو ئازادی و ئافرەت لە ژیاندا هە ڵدێر زۆرن چارەنووس ترینیان هەڵدێری فیکری هەڵدێری سیاسی هەڵدێری ئەدەبی هەڵدێری ئازادین، زۆرن ئەوانەی سالانێکە خەریکی ڕێزکردن و دابێژتن و بەباکردنی وشەن بە جۆرەها شێوەو ڕەنگ دەیانووسنەوەو دەیانوهشێنن، لێ هەتا هەن ناتوانن بن بە شاعیر دنیا پڕە لەو مرۆڤانەی تەمەنێکە گەیشتونەتە لوتکەیەك لەڕەهایی هەڵسوکەوت و پۆشینی بەرگی مۆدێرن، لێ هەتا هەن ناتوانن ئازادبن، هەروەها دنیا لێواولێوە لەو مێینانەی پڕن لە مێیایەتی و لێ ناتوانن رۆژێك ژنایەتی بە خۆوە ببینن، لێرەدا لە سێ هەڵدێر دەفکرین کە هەڵدێری شیعری و هەڵدێری ئازادی و هەڵدێری ژنایەتین.

شیعری ئازاد زمان‌و هونەرێکی تایبەت بەخۆی هەیە چۆن لە نووسینی ساتیرەشیعردا دەبێ بە کەمترین وشە جوانترین مانا بەدەستەوە بدەی لە بۆ نووسینی شیعری ئازادیش دەبێ بە زۆرترین وشە جوانترین مانا بدەیە دەست‌و لێ ئەگەر شارەزاییەکی زۆر لە زماندا نەبێ‌و فیکریش لە پشت نەبێ وەکو چێشتی مجێور دەردەچێ، زۆر کەس هەنە تەمەنێکە دەبەر وشەو فەرهەنگ‌و کتێبان ڕاچوون، بەڵام دە کەس ناویان نازانێ‌و ناوی هیچ دیوانێکیان لە مێشکی کەسدا نەچەسپیوە، هەندەکی دەدی هەنە لەوەتەی دەنووسن بە کۆمەڵێك وشەی لێکچوو سواوو چەند دیوانیان نووسیوەو وەریانگەڕاندۆتە سەر زمانی دیکەو خزێنراونەتە ناو ڤیستیڤالان‌و خەلات کراون، لێ چونکە شاعیر نەبوون کەس لە بیرشی نەماون‌و بەسەرچوون، نووسەری بەسەرچوو چ هەولێك بدا خوێنەر ناهەژێنێ، زۆر کەسی دیکە شاعیربوون، بەڵام وشەو زمان‌و شیعرەکانیان کردۆتە کەرەستەی حیزبایەتی دەسەڵاتداران بە تەنها بوونەتە یادەوەری نووسێك، زۆری دەدی هەرچی نامەی دڵداری‌و یاداشت‌و خەونەکانیان تێکەڵ کردون‌و دەیانوەشێنن بەناوی شیعری ئازاد، بەڵام هەموو ئەوانە لەهەڵدێر دەکەون، بە دیوێکی دیدا زۆر کەس هەبوون شاعیری باش بوون زمانزان‌و خوێندەوارو شارەزابوون شیعری ئازادیان بە شارەزایی نووسیوە، بەڵام چونکە پشوودرێژو خۆڕاگرنەبوونە وەبەر دەستاڕی حیزبایەتی کەوتوون‌و بزربوون.

هەروەها هەندەك مرۆڤ هەنە زۆر ئازادانە لە ژیاندا ڕەفتاردەکەن‌و دێن‌و دەڕۆن، لێ چونکە ئازا نین‌و جەسارەتیان نییە وەکی پوشی بەر

بایان لێ بەسەردێ، چونکە نازانن سنوری ئازادی لـە کـوێ کۆتـایی دێ ولە کوێندەرێ سنووری ئازایەتی دەستپێدەکا، هەندەکی دی ئازادی وەهـا وڕیان دەکا هەتا لە ژیاندا بن بیر لە ئازایـەتی ناکەنـەوە، هەنـدەکی دی ئازادی وا پەلوپۆیان دەخا هەتا دەشمرن ناتوانن جارێك هەستنەوەو ئاوڕێك بۆ پاش خۆ بدەنەوە، بە دیوێکی دیدا بنۆڕین مرۆڤ هەنە زۆر ئازان، بەڵام ناتوانن لە نێوان ئازادیو ئازایەتیاندا خۆڕاگرن، لە هـەموو قۆنـاغێکی ژیاندا ئازایەتیان دەنوێنن، ئازایـەتی بیرکردنـەوەو ئازایـەتی گفتوگـۆو ئازایەتی رەفتار لێك هەڵاوێرد ناکەنەوە بۆیە هەر زوو هەڵدەدێرێن وسـر گوم دەبن.

دنیا پرە لەو مرۆڤانەی داوەستاون لە مێینەتیو بـەڵام هـەتا دەمـرن لەبۆ ساتێکیش ژنبـوون بـەخۆوە نـابینن‌و ژنایـەتی لـە روحیانـدا رەگ داناکوتێ‌و ژنایەتی بە بیرکردنەوەو ژنایـەتی بـە ئاخـافتن‌و ژنایـەتی بـە روح‌و ژنایەتی بەکردار لێك جوداناکەنەوە، نازانن لـە کـوێ مێینـەتیان بینادەکەن لە چ قۆناغێکدا ژنایەتی لـە روحیانـدا دەچەسـپێنن‌و هـەتا کوێندەرێ دەبێ ئازادبن‌و لە کوێڕا دەبێ ئازادیان بینا بکەن.

زۆریان هەنە بە هەموو رە نگ‌و دە نگ‌و روویـەك ژخـۆ دەدوێـن بـە رووی ژنایەتی نەبێ، مێینەتی تەنها وەکو جەسـتە لـە شـیعردا بـوونی هەیەو بۆنی دێ، زۆر کە من ئەو شیعرانەی ژنیان وەکو روح‌و مرۆڤ تێدا داڕێژراوە، بە دیوێکی دیدا لە زۆربەی ئـەو نووسـینانەی بـەناو شـیعری ئازاد دەوەشێنرێن، هەموو شتێکیان تێدا دەبینیەوە تەنها شـیعر نـەبێ،

**زۆربەی ئەو ئازادیانەی بەناوی ئـازادی ژنـەوە پێناسـە دەکـرێن هـەموو مێینەتییەکیان تێدایە تەنها ژنبوون نەبێ.**

**تێبینی: وشەی ژن و ئافرەت بە یەك مانا بەکاردێنم، تەنها بۆ جوانی دەربـڕین ئالوگۆڕیان دەکەم**

**هەژەند: سەرسوڕهێنەر**

# ژنی کورد چیاکانیان چۆڵ نەکردوون
# لەمارگرێت ڕا تا کیژەکانی چیای قەندیل

## مارگرێت جۆرج

(ئەو ژنانەی ڕوولەچیاکان دەکەنو دەگەڵ چیایەکان دەژینو یاخی دەبن، هێندەی چیاکان مەزنو نەمرن)

نەمری گەلێك جۆرو شێوازی هەن، مرۆڤگەلێك لە دنیایەدا لەتێکۆشانو بەرخۆدانو تەقەلاّدان تا بگەنە نەمری، نەمری بەشێوازو کەرەستەو کرداری جودا لەناو پێکهاتەی هەر نەتەوەو کولتوورێك دەهێنە گۆڕین جگە لەناوەڕۆکی نەبێت.

کەسانێك هەن بەرێکەوت نەمر بوون، کەسانێکیش هەموو تەمەنی خۆیان بۆ تەرخانکردووەو کەسانێك هەن بەجۆرەها فرتو فێڵو تەڵەکەبازی خۆ نەمر دەکەن. کەسانیك هەبوون لەژیانیاندا هەرگیز بەخەیاڵی نەمری کارو خەباتیان نەکردووەو خۆیان نەپاراستوە، لێ پاش چەندین ساڵ لەمردنیان ئەو نازناوەیان بەسەردا براوەو نەمربوون، بەپێچەوانەشەوە کەسانێکی دی هەبوون دەمو دەستیان لە هەموو پرسو بابەتێك وەرداوەو ناوی خۆیان لەسەر هەموو لاپەڕان بە نووسین داوە،

بەجۆرەها تەڵەکە سەریان لە هەموو دیوانێك رۆکردوە تا کەنەفت بوون، لێ نەکەس بەچاوی رێز تێی ڕوانیون‌و تێیان دەڕوانێ لەپاش مردنیشیان مردووتر بوون.

نەمری لەهەر یەك لە کایەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا جودایە لە کایەکی دی، بێ لەناوەڕۆکی‌و پەیوەندییەکی قووڵی هەیە بەئاستی رۆشنبیری‌و عەقلانیەتی هەر کۆمەڵگەیەك، بۆیە لە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا کەسانێك کە خودان داهێنان‌و خەباتی هەڵکەوتە نەبووبن ئەو نازناوەیان پێ نەبەخشراوە، بەپێچەوانەشەوە لەهەندەك کۆمەڵگای تردا زۆر بەکتوپڕی‌و بەبێ بنەما دەبەخشنە کەسانی ناشایستەو دەیانکەنە سیمبول، هەروەها چۆن نەمری لەهەندێك کۆمەڵگادا ماناو بنەمای دەگۆڕێن، زۆر جاران لە مابەینی هەردوو ڕەگەزیشدا دەبتە جێی گۆڕانی‌و، پێودانگەکانی بۆ ژنان زۆر ئەستەمتر دەبن لە پیاوان.

سەرەڕای ئەوەی ژنان لە تێکڕای جیهان بە ئەجێندای جوداو شێوازی هەمەجۆر سەرقاڵی تێکۆشانن بۆ وەدەستهێنانی مافەکانیان، هەمیشەش نەمریان پڕ ئاستەنگترو دژوارترە لەهی پیاوان.

ژنانێك هەن لە ژیاندا گەلێك سەرسەخت‌و تێکۆشەرن، لێ چونکە سەر بەئایدۆلۆژیایەکی باونین دەکەونە بەر دەستاڕی سیاسی‌و حیزبایەتی‌و لەبیردەکرێن، یا ژنانێك هەن زۆر سەرکێش‌و بەتوانان، لێ کەوتونەتە داوی خۆشەیستی پیاوێکەوە تا دەژین دەبنە قوربانی‌و بە ژنێکی سووك ناوزەد دەکرێن، هەر لەناو شۆڕشەکان ڕا تا ناو کایە

سیاسیو رۆشنبیریو کۆمەڵایەتەکان تژین لە ژنی دڵ بریندار، هەموو بەرهەمو تێکۆشانو خەباتیان کەس بە چاوی ڕێز تێی ناڕوانیێ، لەیەك لە قوژبنەکانی ماڵێکدا بە تەنهایی دەتوێنەوە.

ئەگەر بەسەرنجێکی قووڵ رۆبچینە ناو ئەو زنجیرە مێژووییەی شۆڕشو خەباتی گەلی کورد پێیدا تێپەڕیوە چەندین ژنی هەڵکەوتەو ئازاو پێشمەرگە دەبینینەوە، کە بەجۆرەها شێواز بەشداریان لەخەباتی سیاسیو چەکداری لەسەردەمی شۆڕشدا کردوەو، هەندەك جار گەیشتونەتە پلەی سەربازی بەرزو دیار، کە نموونەیان (مارگرێت جۆرج)ە

ئەو کیژە ئاشورییەی بوێرانە لە تەمەنی بیست ساڵیدا، لەساڵی هەزارو نۆسەدو شەستو یەکدا پەیوەندی بە شۆڕشی کورد کردوەو تاوی داوەتە چەكو، لەماوەی هەشت ساڵی خەباتی چەکداریدا، بەشداری گەلێك شەڕی کردوە، بەناوبانگترینیان شەڕی دۆڵی زاوێتەیە، وەکو فەرماندەیەك ڕۆڵی بەرچاوی هەبووە، لەگەڵ مەفرەزەکاندا هاتۆتە دەشتی بیتوێنو پشدەر. هەتا لە ساڵی هەزارو نۆ سەدو شەستو نۆ لەگوندێك بەناوی (قەلاقومری) شەوێك لەخەوێدا شەهید کراوە، لەڕووداوێکی نادیاردا ناوی زڕاوو ناوی ژێرگڵ کراوە، هەموو دەزانین هەشت ساڵ خەباتکردنو جەنگان لە بارودۆخی کۆمەڵایەتیو سیاسی ئەو سەردەمەیدا مێژووییکە، بەڵام بزرکردنو نائاگایی ژنی کوردیش جێی خەمێکی قووڵە، لێرەڕا وەدەردەکەوێ کە ژنی کورد بەشداریش نەبێ لەزیندەبەچاڵکردنی خەباتگێڕانی، بێگومان پشتگیری ئەو کارەساتەیە کە ئەوڕۆ ژنی کورد تێیدا دەژی.

دەنا چۆن بەخۆ ناکەوێ بۆ پیرۆزڕاگرتنی مێژووی خۆیو بەسەرکردنەوەو کۆکردنەوەی هەموو ئەو ژنە پێشمەرگانەی دەستو پەنجەی جوانیان لەسەر تفەنگەکان داناوە بۆ شەڕکردن بەرامبەر رژێمێکی وەها دڕندە، ئەورۆش بەئاسانی لەنێو هەموو کایەکانی ژیاندا پەراوێز دەکرێ، سەرباری ئەوەی مێژووشی دەشێوێنرێ، لەبۆیە ئەز دڵنیام هەتا ژنی کورد هەنگاو نەنێ بۆ رێزگرتن لە مێژووی خۆیو بایەخدان بەو هەموو رەوشتو ئەدگارە جوانانەی لە ژیانی ژنی کوردی ڕەسەندا هەبووە، هەرگیز ناتوانێ هەنگاوێك پێشکەوێو لە ئێستا پتر دادەڕوخێ.

ئەوەی جێی ئاماژەیە، ئەو سیستەمە نوێیەی جیهانو جیهانگەرایی چۆن کۆمەڵێك سیاسی باوو هونەرمەندی باوو رۆشنبیری باوو کۆمپانیای باوی کردونەتە ئەستێرەو، لەهەموو کەناڵێك ڕا دەوەشێنرێن بەدنیا دەناسێنرێن، کۆمەڵێك ژنی باویشی لەنێو هەریەك لەکایەکانی ژیاندا کردۆتە ئەستێرەی دنیاو بەرەبەرەش نەمریان پێدەبەخشێ. بەهەمان ڕێچکەشدا لەکوردستان کۆمەڵێك ژنی باو بوونە ئەستێرەی هەر یەك لەکایە سیاسیو رۆشنبیریو کۆمەڵایەتییەکانو بە کەیفو ویستی خۆیان نازناوی ژنی خەباتکارو نەمر دەبەخشنەوەو، لەهەموو تیڤیو ڕۆژنامەکان ڕا جارِی خەباتی پڕشنگداری ژنی کورد دەدەن، بەبێ ئاگاداربوون لە مێژووی چەکداری ژنی کوردو بەرز ڕاگرتنو نرخاندنی بەدەیان ژنی پێشمەرگەو زیندەبەچاڵکردنی نازناوو وێنەیانو، خۆ گێل کردن لەو شۆڕشگێڕانەی لە چیای قەندیل خەبات دەکەن، رۆژانە لە

جۆرەها سەنتەرو ڕێکخراوو دەزگایەکانیان لەژێر نـاوو دروشمـی ئـازادیو کۆمەڵگەی مەدەنیدا چەندین کۆڕو سیمینار دەبەستن، لەسەر فێمینیزمو ناوی چەند ژنە نووسەری ڕۆژئاوایان دەرخ کردوونو وێـردی سـەرزمانیان فێمینیزمو یەکسانیو ئازادییە، بەرگەی یەك تاکە ڕەخنـە نـاگرنو بـە پلانی پیاوان دەکەونـە سـەنگەرگرتن لەیـەکتریو نـاوو نـاتۆرە لەیـەك هەڵدانیێ.

ئەگەر سەرنجێك باوێینە سەر ئـەو قۆناغانـەی شۆڕشـەکانی کـورد پێیدا تێپەڕیوە، بەتایبەت لەسەرەتای پەنجاکانی سەدەی رابوردوودا ژنـان سەرباری بارودۆخی کۆمەڵایەتی ڕوویـان لەچـیایەکان کـردووەو لـەریزی خەباتدا بوون، بەتایبەتی لـەناو ریزەکـانی حیزبـی شـیوعی، یـەکێتیی نیشتمانی، کۆمەڵەی ڕەنجدەرانو حیزبی دیموکراتی ڕۆژهەلاتـدا بەشـێوەو لەکاتی جودا جودا دا بەشداری خەباتی چەکداریان کردوەو چـیایەکانیان چۆڵ نەکردون، لـێ لەبـەر نـەبوونی بەرنامـەو سـتراتیژیەکی بەبنـەماو باوەڕی تەواو بـە خـەباتی ژنـان، هەنـدێکیان بـەپلان دوورخراونەتـەوەو هەندێکیان پەرتەوازەبوون بۆ ئێرانو تاراوگە.

پێشمەرگەی ژن لەسەرەتادا لـەنێو شۆڕشـی ئـەیلول دەسـتی داوەتـە چەكو گەیوەتە پلەی سەربازی، نموونـەی هـەرە جـوانیش (مارگرێـت)ە، پاشان لەناو ریزەکانی حیزبی شیوعی چەند ژنێك بوونەتـە پێشـمەرگە، دواتر بەرەبەرە ژنان لەناو ریزەکـانی کۆمەڵـەی رەنجـدەرانی کوردسـتانی ئێرانو حیزبـی دیمـوکراتی کوردسـتانی ئێرانـدا هاتوونەتـە ریزەکـانی

شۆڕش، تاویان داوەتە چەكو پاشان لەناو كۆمەڵەی رەنجدەرانو یەكێتیی نیشتمانیو سۆشیالیستدا ئەو خەباتە درێژەی هەبووە.

هەروەها ئەگەر هەندێك قـووڵتر ڕۆبچـینە نـاو قۆناغـەكانی شـۆڕش، تەواوی ئەو ئەزموونە كرچوكاڵانەمان بۆ وەدەردەكەون كە بە بـەردەوامی دووبارە بوونەتەوەو بەدەوری خۆدا خولاونەتەوە، نموونەی هەرە بەرچـاویش ژنی چەكدارە یاخود پێشمەرگەی ژنە، كە بە گوڕو بە هانـدانێكی زۆرەوە هێنراوەتـە نـاو شۆڕشـەكانو چـەكداركراوەو، لـێ لەبـەر بێئـەزموونی نەتوانراوە وەكو كادیرێك سـوود لـە هێـزو شـارەزایی وەربگـیرێ ودەوری سەرەكیان پێبدرێ، لەبۆیە پاش ماویەك لـەناو شـۆڕش ماوەتـەوەو، لـێ چونكە لەبناغەو پرەنسـیپی شۆڕشـەكاندا ژن بەكەسـایەتیەكی كامـڵ جێگای بۆ دیاری نەكراوەو بە كەسی پلـە دوو ناسـێنراوە، بۆیـە ئاسـتی تێـڕوانینی بەرامبـەری لـە بازنەیـەك دەرنەچـووە، هـەر زوو تـەماحیان لـەجوانیو ناسـكیو ژنایـەتیان كـردوونو وەكـو دڵـدارێك تووشـی سەرلێشێوانیان كردوونو پاشان دەسبەرداریان بوونو بەجێیان هێشتوون، تووشی داڕوخانی دەروونیان كردوونو كەوتەنەتە نـاو قـەیرانی سـەختی كۆمـەڵایەتیو دەوری گرنگیان لەناو شۆڕشەكاندا پێنـەدراوە، بـەكتوپری پەراوێزكراونو بەناچاری ڕێگای مێردكرنیان گرتۆتەبـەرو نـاوو ڕۆڵیـان لەژیاندا تەواو بووە.

كۆی شۆڕشە چەكداریەكانی كورد خاڵی نەبوون لەڕۆڵی ژن چ بەتاكو چ بە گرووپ بووبێتو، بەجۆرەها شێواز خەباتی خۆیان درێژە پێداوە، لێ هەڵپەساردنی ژنی كورد لـە شۆڕشـە چـەكداریەكان، هەڵپەسـاردنێكی

مێژووییەو پاشاخانێکی مێژوویی هەیەو پاشەکشێ کردنی لەنێو ڕیزەکانی شۆڕشو سەرهەڵگرتنی، پەیوەندییەکی قووڵی هەیە بە پێکهاتەو ئاستی جیهانبینیو پێگەیشتوویی سەرکردەو ڕێبەرانی شۆڕشەکان.

دیوی هەرە دیارو بەرچاوی هەڵپەساردنی مێژوویی ژنی کورد، لەو گرنگی نەدانە بەو مێژووەو لەبیرکردنو بەسەردا تێپەڕینو خەباتی ئەو ژنانەدایە، جگە لە چەند سیناریۆیەکی حیزبی نەبێ کە بەناوی ڕێزگرتنو یادکردنەوەی خەباتی ژنی کورد، بەشێوازگەلێکی جودا سازدەدرێنو دەکرێنە یادو یادەوەری لەکۆڕو سیمینارەکاندا.

هەروەها بوونی ژنانی کورد لە چیای قەندیل، کە تاکە شۆڕشی چەکداری ژنن لەو سەردەمەیدا بەو چەندایەتیو چۆنایەتیەوەو پشتگوێ خستنیان لەلایەن ژنانی باوی ناو کایە سیاسیو ڕۆشنبیرییەکاندا جێی تێڕامانو لەسەر ڕاوەستانە، ئەگەرنا چۆن ڕۆژانە خوێنی کیژی کورد بەسەر بەردەکانی چیایاندا هەڵدەڕژێو لەلوتکەی جوانیو پاکیدا شەهید دەکرێن، لێ بەدەگمەن نەبێ هیچ ژنێکی سیاسیو ڕۆشنبیرو نووسەر ئەوە بە پرسی خۆ نازانێو نایکاتە بابەتێکی گرنگو جێی لێکۆڵێنەوەو، وەك بەشێك لە مێژووی خۆی، ئەگەرچی زۆرجار لەناو میدیاو چاپەمەنیەکانی زۆر لە وڵاتانی ئەورووپادا ئەو بابەتە دەوروژێنرێو گرنگی پێدەدرێ.

دەکرێ بڵێین ژنان بۆ خۆیان ڕێگا خۆشکەرن بۆ هەڵپەساردنی مێژووی خۆیان، چونکە زۆر ئاسان مێژووی خۆیان لەبیرکردوەو پشتگوێ

خستووه، بۆ نموونه خۆگێل کردن لەئەزموونی ژنانی خەباتکەر کە لەقۆناغەکانی شۆڕشدا، کە لە بارودۆخێکی سەختدا ژیاون، بەرامبەر دوژمنی دڕندە چۆن راوەستاون هەروەك چۆن گوێ نەدانو بێ بایەخکردنو گلّ وەسەردان بۆتە کولتوورێکی حیزبیو، لەجۆرها کەناڵ راکاری بۆ دەکریّو بەپلانی عەنتیکە عەنتیکە کەسانی خەباتکارو خودان ویژدانو بەهەڵوێست پەراوێز دەکرێن، ژنانیش بەدەرنین لە تێوەگلان لەو بارودۆخەو دەستەوەستان بوونیان.

# زمان‌و ئاسایشی نەتەوەیی

شۆڕشەکانی زمانی کورد پێوستییان بە شۆڕشگێڕی گەورەو زانا هەیەو، سەنگەرەکانی زمان شێوازو نەخشەی نوێیان پێدەوێن، نووسین‌و بڵاوکردنەوە ئەرك‌و لێپرسراویەتێکی ئەخلاقییەو، هەریەکیان چەندین کۆدی ئەخلاقی گرنگ‌و گەورەی خۆیان هەیە، لەبۆیە لەسەر نووسەر پێویستە بیانپارێزێ‌و نەیانبەزێنێ. بەڕای من دەست دانە قەڵەم وەکو دەستدانە تفەنگ وەهایە، ئەگەر مرۆڤ زۆر وریاو زیرەك‌و بە ویژدان‌و ڕەوشت نەبێ، یا خەڵکی پێدەکوژێ یا خۆی پێدەکوژێ‌و گەورەترین زەرەر بە زمان‌و ناوی ڕۆشنبیرو نووسەر دەگەیەنێ..

نووسین‌و بڵاوکردنەوە لەو قۆناخەی ئێستای ژیانی کورددا، کارێکەو بە پرۆسەیەکدا گوزەردەکا، کە دەکرێ پێی بێژین پێشێلکردن‌و تێکشکانێکی ئەخلاقی قووڵ‌و تا سەر ئێسقان خەمهێنەرەو، مرۆڤ تووشی ڕەشبینی‌و نائومێدی دەکا، نووسەر هەیە ئامادەیە دەست‌و دەم لەهەموو پرسێك وەربداو هەموو پرەنسیپێك تێکبشکێنێ، تەنها بۆ ئەوەی بناسرێ‌و ناوو وێنەی خۆی ببینێ لەسەر بابەتێك.

دەبێ هەموومان سەرنجێك لە زۆربەی زۆری ئەو جۆرە نووسینو بڵاوکردنەوەیەی ئەورۆ لەکایەی رۆشنبیریی‌و سیاسیی‌و رۆژنامەگەرییدا دەبینری بدەین، کە وەکو مۆدیلێکە چۆن مۆبێل تەلەفۆن بۆتە مۆدێلێك‌و دەبێ هەر کەسێك هەیبێ‌و دەستی بداتێ بەبێ ئەوەی زۆر گرنگ بێ بۆ ژیانی‌و، یا بەهۆیەوە دەورێك یا بەرپرسیاریەتێکی پێبگێرێ، بەو مانایەی هەموو کەسێك دەبی نووسەر بێ‌و، بە کەیف‌و مەزاجی خۆی قەڵەم بوەشێنێ‌و بۆ مەرامی کەسی دەست لەناو ژیان‌و بابەتی هەستیار بنێ، هەروەها رۆژێ لەدەیان سایت‌و رۆژنامەو گۆڤاردا نووسینەوەی قسەی گشتی بەناوی وتارو ڕەخنە دەبینین (حەتمەن ئەو رایەم بەو مانایە نییە کەسێك بریندار بکەم کە خولیای نووسینی ڕاستەقینەی هەیە، چونکە هەر کەسێك دەست بداتە قەڵەم بۆ من خەونێکە شانازییە، لێ بەمەرامی نووسینی بە بنەما، نەوەکو ئەو حاڵەتە گشتییەو ئەو داباریینە نووسەریەی ئەورۆ هەیە).

دەبێ هەموومان بزانین پێشیلکردنی ئەخلاقیاتی نووسەری ئەورۆ لەلوتکەدایە، چونکە نووسەر هەیە لەگەڵ نووسینی کتێبێك یا وتارێك بەهیلاك دەچێ، لێ پاش بڵاوکردنەوەی دەبینێ زۆر بەسانایی ناوەرۆکی بۆچونەکانی، یا زۆر جار دەستەواژەو پەرەگرافەکانی خۆی لەناو وتارێك‌و بابەتی کەسێکی تردا دەبینێتەوە بەبێ ئەوەی ئاماژە بەسەر چاوەکانی بکرێ! نووسەر هەیە پەنجا ساڵە دەنووسێ کۆڵێك زانیاری‌و ئەزموونی هەیە، لێ بە ساڵ‌و دووساڵ بەرهەمی لە دەزگای چاپ‌و بڵاوکردنەوەکان دەکەوێ‌و هەر رێگای چوونە ژۆری ئەو دەزگاو دامەزراوانەی پێنادرێ‌و،

لەهەمان کاتیشدا بە لێشاو بەرهەمی پڕوپوچو بازاڕی لە کتێب فرۆشیەکاندا هەڵدەڕێژرێن.

ئەو بێسەروبەریو تێکچڕژانەی لە کایە رۆشنبیریو نووسینو ڕەخنەگرتنی ئەورۆ دەیبینینو هەستی پێدەکەین، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە بەو تێکچڕژانو بێسەروبەریە سیاسیو ئایدولۆژیەییەی ژیانی کوردی تەنیوەو، کایەی رۆشنبیرییش دەرهاویشتەی سەرەکیەتی، چونکە پاش ڕاپەرینو ئازادی، کورد بە شەپۆل بەناو دروشمی دیموکراسیو ئازادیو ئازادی رۆژنامەگەریو زۆر بواری دیکەش کە لێرە جێی باس کردنیان نیە، بەبێ بوونی دیپلۆماتیەتو بنەمایەکی ئەکادیمی ڕێگەی بە رەگ هاویشتنی زۆر بابەتو گرووپو دیاردەدا، لەپاش ئازادکردنی عێراقیش بەهەمان شەپۆلو هەڕەمەکی باوەشی لەبۆ تەکنەلۆژیا کردەوەو، بوونی رۆژنامەی ئەلکترۆنی نووسینو بڵاوکردنەوە بەبرەو کەوت بەبێ هیچ رێساو یاسایەك.

نووسەر هەیە هەموو ژیانی خۆی بە نووسین بەخشیوەو بەچەندین کتێبی چاپکردون، لێ هێندەی ئامێرێکی مۆبایل ناسراو نییە! هێندەی مۆبایلێك بۆتە خەیاڵو روئیای گەنجێك، کتێبێك نەبۆتە بابەت بۆی! راستە لە هەموو وڵاتانی دنیادا ئەو شەپۆلە تەکنەلۆژییە هەیەو هەمان دیاردەش هەنە، لێ لەهەمان کاتدا زۆربەی زۆری گەنجان، پاشخانێکی رۆشنبیریو خوێندنەوەیان هەیەو ئاگاداری دەرچوونی نوێترین رۆمانو داهێنانی ئەدەبین.

زمان لەو قۆناخەدا زمانێکی ماندووەو، پەلوپۆیەکی فەرهەنگی قوولْ ناهاویْو نویْ نابێتەوە، چەقی بەستوەو، لەگەلْ بەرژەوەندی تاکەکەسی گروپەکان ڕێدەکاو خۆ دەگونجێنی، بەو مانایەی زمانێك نییە بالاّترو نموونەیی تر پێناسەو تایبەتمەندی خۆی پاراستبیْ، دەگەلْ ئەو زمانە لەبارچوانەی ئەورۆ دەوەشێنرێن.

وەشانی زمان بە خەراپی بە ڕێگادان بە جێگیربوونی زمانی بەسەرچوو، زمانی پیس وەکو ئەو خواردەمەنییە ئێکسپایەرو بەسەرچووانە وایە، کە رۆژانە بە خەلْکی هەزار دەفرۆشرێن‌و دەبنە هۆی ژاراوی بوون‌و مردن کەس لە قوربانییەکانیان ناپرسێتەوە! لیْ هەموو ئەو پرسە خەتەرانە بەهەند وەرناگیرێن‌و بەسەرماندا تێدەپەڕن.

دەبیْ هەموومان بزانین، کە زمان پەیوەندی گرنگ‌و قوولْی هەیە بە (ئەمنی قەومی) ئاسایشی نەتەوەیی، هەروەك چۆن خواردەمەنی یەکە لە بابەتەکانی ئاسایشی نەتەوەیی، زمانیش هەمان کاریگەری هەیەو بەدواداچوون‌و لێپرسینەوەو پارێزگاری لێکردنی ئەرکێکی نەتەوەییە، بەتایبەت بۆ نەتەوەیەکی وەکو کورد کە تا ئێستا لە باکوری کوردستانیْ لەسەنگەرەکانی زماندا شوڕش بەردەوامە.

هەروەها ئەو هەموو تێکشکانە روحیەی بەسەر ئەو نەتەوەیەدا هاتووە، جیْو کاریگەری خۆی هەبووەو بەجێهشتوە بەسەر زمانی ئەدەبی‌و تێکشکاندنیدا، چونکە بەڕای من بزاوتنی زمان بە هەلْەو بە بیْ لێپرسینەوە دەبتە هۆی تێکشکانی ئەو زمانەو، وەکو ئەوەیە چەند مینێك لەمالْی خۆدا بچێنی.

لەبۆیە دەبێ خوێندنەوەی تایبەتمان بۆ زمان هەبێ وەکو هەر نەتەوەیەکی دیو، زمانەکانمان لیك جودا بکەینەوەو هەوڵدەین بۆدارِشتنی سیاسەتی زمان لەهەموو کایە سیاسیو رۆشنبیریو مەعریفیەکاندا، چونکە ئەگەر نەتەوەیەك زمانی پێ نەپارێزرێ چۆن دەوڵەتی پێ دەپارێزرێ.

رِەخنە دەرهاوێشتەیەکە لە تۆکمەبوونی هەر بوارێكو یا بۆ پتر پێشکەوتنو تۆکمەبوونی هەر کایەیەك لەکایەکانی ژیانو، ئامرازێکیشە بۆ زیندوو راگرتنو پاراستنی ئەو کایەیە، رەخنە شێوازو زانستو کەرەستەو سنوورو ئامرازی تایبەت بە خۆی هەیەو، دەبێ دەست بۆ بردنی وەکو ئەرکێك سەیربکرێ.

ئەگەر لە رەخنەی زمانەوانی بهزرین، دەبینین زمان بۆخۆی ئێستا لە قەیران دایەو، پەیوەندی بەو قۆناغە هەیە کە رۆشنبیری کورد پێیدا تێدەپەرێ.. ئەوەی ئێستا بەناوی رەخنەی ئەدەبی دەیبینین، زۆربەی زۆری جگە لە هەندەك پێداهەڵدانی حیزبی یا تێکشکانی روحی نەبێ هیچی تر نییە!

دەنا چەند رۆمانی باش بنووسرێو بڵاوبکرێتەوە کێ باسی دەکا؟ بەدەیان وتاری پڕ ناوەرۆك بنووسرێ کێ دەیخوێنێتەوە؟ بێ لە چەند خوێنەری راستەقینە نەبێ، لێ ئەگەر رۆژانە لەسەر سایتو لاپەڕەی هەندێك رۆژنامە بڕوانی، رِێکلام بۆ هەندێك نووسەری بەرژەوەندی بۆ رۆیشتوو دەکرێو، وێنەو بابەتیان وەکو رِێکلامی کۆمپانیاو مۆبێلو تەلەفۆن بە رەنگاوڕەنگی بڵاودەکرێنەوەو دەوەشێنرێ، لەودەمەیدا

چەندین نووسەری دانسقە هەنە لە کوردستانو لە تاراوگە کەس بانگهێشتی کۆڕو سیمینارێکیان ناکەنو گۆشەی ڕۆژنامەو گۆڤارێکیان بە شایان نازانن، چ جای ئەوەی گرنگی بە بابەتیان بدرێ لە بڵاوکردنەوەدا!

نەتەوەی کورد ئێستا لەسەرەتای شۆڕشی زمان دایە، دەبێ قۆناغگەلێکی سەختو جیاواز ببڕێ، زۆر بە کارامەیی زمانی سیاسیو زمانی ئەدەبی بەرەوپێش ببات و ببزێوێو بوەشێنێو، ڕەچاوی ئەخلاقیاتی زمانی نووسینو بڵاوکردنەوەی خۆی بکاو، بەرەی نوێ بۆ پاراستنی زمانی خۆی دروست بکا، لەدوژمنە گەورەکانی خافڵ نەبێ، چونکە ئەوان نەخشەو پلانی دوورو درێژیان بۆ پەکخستنی زمانی کورد داڕشتوە.

# شیعری بن نایلۆن و گوڵی بن نایلۆن

کۆڵەوار لە وشەی کـۆڵ را هــاتووە، یــەك لەمانایــەکانی کـۆڵ بــەو ئەندامەی جەستە دەوترێ، بە هۆی سووتان یا قرتان پەکی دەکەوێ و لــە کارکردنی ئاسایی دەکەوێ وەکو پەنجەکان، ئــەز لەبۆیــە لێــرەدا بــەکارم هێناوە، چونکە کاری نووسین دوای مێشك بە بەپەنجــەو دەســت دەکــرێ، بەڵام ڕێی تێدەچێ بیریش کوڵ بێت ...

شاعیر ئەگەر نەیتوانی نووسەری تەرزە شیعرێك بێت، خۆ لــە زەیــنی خوینەر وەکو چەپکەگوڵێك بچەسپێنێ ئــەوا شــاعیرێکی کۆڵــەوارەو زوو دەمرێ...

شاعیر ئەگەر لەناخی ڕا بزێوو ســەرەڕۆ نــەبێ و شــاعیرانە نــەهزری و نەژی و، شاعیرانە نەتلێتەوەوو نەگری، شــاعیرانە عاشــق نــەبێ، زۆر زوو کۆڵەواردەبێ و دەمرێ...

شاعیر ئەگەر نەیتوانی بە پۆل وشەی جوان بهێنیتە ناو شــیعرو، زۆر کارامە زمان بلێسەدار بکاو وەك مۆزەخانەیەك ڕایەڵەی چــەندین وشــەو دیالێکتی جودا لە شیعردا بپاریزێ، ئەوا شــاعیرێکی بــیر نەزۆکــەو زوو دەمرێ...

ئەز لەخۆبایی نیم، لێ دڵگرانم لەوەی لەوقۆناغــەدا، کــە رۆشــنبیری کوردی تێیدا بەتەڵەوە بووەو لە قەیران کەوتوە، قەڵەمێکم بەدەستەوەیەو جار جار ورتکە سەرنجەکانی خۆم بەسەرپێی دەوەشێنم، لەدەسبەردابوونی شیعریش دەرەقەتی خۆم نایــەم، دەنــا زۆرجــاران پەشــیمانییەکی قــووڵ و شەرم دامدەگرێ، هەمیشەش ئــەڤ تــرس و دڵەڕاوکێیــەم تێوەردەســورێ، نــەوەکو لــەناخافڵیان رۆژەك نــاوی شــیعر بــزرێنم و وشــەیەك دووجــاران بســـوێنم و، لـــەنائاگایی و گەمـــژەیی تۆزقاڵێـــك زمـــان بڕوشـــێنم، لەهەڵبژاردنی وشەو دەســتەواژەیەکدا ڕەتــەڵ بــەرم لــەتاریفکردنی نــاوو فرمان و گوزارەو ئاوەڵناوێکدا سەرچــیخ بــڕۆم، لــە وێنــاکردنی دیمــەنێك دەستم کورت بێنی و، لەدەکاربردنی رەنگێك بە سەهوو بچم .

چەند شەرمێ دەکەم لەوەی نەوەك رۆژێك وڕێنەیەك بنووسمەوەو لــەژێر ناونیشانی شیعر بڵاویبکەمەوە، پێپڕکە لەناو وشەی عەرەبی و فارسییدا بکەم و، لەتەنیشت ناوی خۆشم بنقیسم شاعیر!!

حەزدەکەم بەدەستی خۆم پێنوسەکەم بشکێنم، بەڵام جارێك نــەیبزێوم بۆ بیرۆکەیەك یا وشەیەك، کە لە قووڵایی ناخی خــۆمڕا هەڵنــەقووڵابێ و خۆڕسك نــەبێ، قــەت دەســت نادەمــە قەڵــەم تــا وەکــو بــیرم بەتــەواوی تەنگەتاوم نەکات و خەیاڵم وەکو شەمامە نەڕەنگێ، چونکە دڵنیام بەدەر لەو حاڵەتانە شیعری دەستکرد بەرهەمدێنم، کە ناوی لێ دەنێم: شیعری بن نایلۆن، وەکو گوڵی بن نایلۆن یا سەوزەی بن نایلۆن بێ تام و بێ بــۆن، تەنها بۆ خافلاندن و بەرمێنهێنی چێژو بزوێنەری بازاڕە، بــە دیــدی مــن شیعری سروشتی وەکو خواردنی سروشتی وایە، کە هیچ بۆن و هیچ تــام و

هیچ ڕەنگێکی دەستکردو گۆڕدراوی تێدا نییە، لە بۆیە هەر شیعرێك کە وشەیەکی ناخۆڕسكو خەیاڵێکی دزراوو هەناسەیەکی بەراوەژووکراوی شاعیرێکی دی پێوە بێت، قەت نابێتە شیعری ڕاستەقینەو چێژ نابەخشێتە خوێنەر.

جێی سەرسوڕمان نییە لەسەردەمێکدا دەژین، کە دەکرێ پێی بێژین سەردەمی ژیانی بن نایلۆن یا ژووری شوشەیی، چونکە هیچ کایەیەك لە کایەکانی ژیان بە سروشتی گەشە ناکا، بەڵام ئەوەی لێرە جێی سەرنجە کایەی ئەدەبە هەر لە ناوزەدکردنی ڕۆمانەکان بە ڕۆمانە باش فرۆشەکانیو دنیاو ڕۆمانە پڕفرۆشترینە نێودەوڵەتییەکان تا تۆمارکردنی شیعر لەسەر سیدیو ناونانی گەلێك وڕێنە بە کۆمەڵە شیعرو شیعری ئازادو هەڵنانو ڕۆنانیان لە جۆرەها کەناڵ ڕا ... بەشێوەیەکی خێراو بۆ مەبەستی بازرگانیو بۆ کاتێکی دیاریکراو بە هەمان ڕێڕەوی ژووری نایلۆندا دەگوزەرێن...

شاعیری بن نایلۆن تەنها بیر لەڕازاندنەوەی ڕووکەشی بەرهەمەکەی دەکاتەوە، وەکو بریقەدارکردنو ڕەنگکردنی فۆرمو ستاتیکاو خەیاڵی خۆی، شاعیری بن نایلۆن هەمیشە عەوداڵە تا وشەی قەبەو پڕ گرێ وگۆل خڕکاتەوە، یا تەرزە وشەیەکی ئیرۆتیکی پووچ بە شیعرەکەیدا وەکو نرخ هەڵواسێ .... شیعری بن نایلۆن هەموو کەس توانای نووسینو خۆ لێ تاقیکردنەوەی هەیە، بەو مانایەی ئەگەر شیعریشی پێ نەنووسرێ، بەڵام دەتوانێ شیعر تێك بداو چێژێ خوێنەر لەکەدار بکا.

شیعری بن نایلۆن چونکە بێتام‌و بێ بۆنە، بۆیە شاعیر هەڵدەستێ بە تێکەڵاوکردنی بۆن‌و تامی دروستکراو بۆ نموونە دیزاینکردنی لەسەر لاپەڕەی ڕەنگاوڕەنگ‌و تێکەڵکردنی لەگەڵ فۆتۆو مۆنتاژێکی بازاڕی تا چاوی خوێنەر ڕابکیشێت بۆ خوێندەنەوەی.

شاعیر ئەگەر کەوتە ئەوەی بەرهەمی بن نایلۆن بەرهەم بهێنێ هەر زوو دەست لە نووسینی شیعر بکێشێتەوە باشترە نەك وەکو ڤایرۆسێك لە جەستەی شیعردا بژی‌و ببێتە هۆی شێواندنی تەندروستی شیعردۆستان .

شیعری بن نایلۆن دەبێتە هۆی ڕسکانی چێژی بن نایلۆن، بەو مانایایەی نەوەیەك پەروەردە دەکا کە تێڕوانینی سەرپێی‌و خێرایان هەیە بۆ شیعر، پێیان گرنگ نییە ئەو شیعرە بۆ جاری دووەم دەبیننەوە یا لە بیریان دەمینێ.

شاعیر هەرکە کەوتە کۆڵەواریە، بەبای پیلان وشەو رستە بەزایە دەداو، لێ ناگاتە مانایەك، شەووڕۆژان تێکدەکاتەوە، لێ ناگاتە چڕکردنەوەی خەیاڵێك، دەکەوێتە ڕنینەوەی شیعرو ناگاتە وێنەك، دەکەوێتە خڕکردنەوەی وشەی بازاڕی‌و قەت لەبۆی گرنگ نابێ کێ خوێنەریەتی‌و، چ جۆرە خوێنەرێك چاوەڕێی دەکا، یا چ جۆرە جەماوەریك بۆ شیعری خۆی دروست دەکا.

# زمانی ئەدەبیو نووسینی ڕەخنە

نووسینو بڵاوکردنەوە ئەرکو لێپرسـراویەتێکی ئەخلاقیـەو چـەندین کۆدی ئەخلاقی گرنگو گەورەی خۆی هەیەو لەپاشە، کە لەسەر نووسەر پێویستە بیانپارێزیو نەیانبەزێنێ، بەڕای من دەست دانـە قەڵـەم وەکـو دەستدانە تفەنگ وەهایە، ئەگەر مرۆڤ زۆر وریـاو زیـرەكو بـە ویـژدانو ڕەوشت نەبێ، یا خەڵکی پێدەکوژێ یا خۆی پێدەکوژێو گـەورەترین زەرەر بە زمانو ناوی ڕۆشنبیرو نووسەر دەگەیەنێ..

نووسینو بڵاوکردنەوە لەو قۆناخەی ئێستایی ژیانی کورددا کارێکـەو بـە پرۆسـەیەکدا گوزەردەکـا کـە دەکـرێ پێـی بێـژین پێشـێلکردنو تێکشکانێکی ئەخلاقی قووڵو تا سەر ئێسقان خەمهێنەرەو مروڤ تووشی ڕەشبینیو نائومێدی دەکا.

بەڕاشکاوی دەڵێم زۆربەی زۆری ئـەو جـۆرە نووسـینو بڵاوکردنەوەیـە ئەوڕۆ لەکایەی ڕۆشنبیریو سیاسیو ڕۆژنامەگەریدا دەبینرێ، مۆدیلێکە وەکو چۆن مۆبێل تەلەفۆن بۆتە مۆدێلێكو دەبێ هەر کەسێك هەیبـێو دەستی بداتێ بەبێ ئەوەی زۆر گرنگ بێ بۆ ژیانیو یا بەهۆیەوە دەورێـك یا بەرپرسیاریەتێکی پێ بگێڕێ، بەو مانایـەی هـەموو کەسـێك دەبـێ نووسەربێو بە کەیفو مـەزاجی خـۆی قەڵـەم بوەشـێنێو بـۆ مـەرامی

کەسی دەست لەناو ژیانو بابەتی هەستیار بنێ (حەتمەن ئەو رایەم بەو مانایە نییە کەسێك بریندار کەم کە خولیای نووسینی ڕاستەقینەی هەیە، چونکە هەر کەسێك دەست بداتە قەڵەم، بۆ من خەونێکە شانازییە لێ بەمەرامی نووسینی بە بنەما نەوەکو ئەو حاڵەتە گشتیەو ئەو دابارینە نووسەریەی ئەورۆ هەیە).

ئەو بێسەروبەری‌و تێکچرژانەی لە کایەی رۆشنبیری‌و نووسین‌و ڕەخنە گرتنی ئەورۆ دەیبینین‌و هەستی پێدەکەین، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە بەو تێکچرژان‌و بێسەروبەرییە سیاسیی‌و ئایدولۆژییەی ژیانی کوردی تەنیوەو کایەی رۆشنبیریش دەرهاویشتەی سەرەکیەتی، چونکە پاش ڕاپەرین‌و ئازادی، کورد بە شەپۆل بەناو دروشمی دیموکراسی‌و ئازادی وئازادی رۆژنامەگەری، زۆر بواری دیکەش کە لێرە جێی باس کردنیان نییە، بەبێ ئەوەی بەبێ بوونی ستراتیژییەت بنامایەکی ئەکادیمی ڕێگەی بە رەگ هاویشتنی زۆر بابەت‌و گرووپ‌و دیاردەدا، لەپاش ئازادکردنی عێراقیش بەهەمان شەپۆل‌و هەرەمەکی باوەشی لەبۆ تەکنۆلۆژیا کردەوەو بوونی رۆژنامەی ئەلکترۆنی، نووسین‌و بڵاوکردنەوە بەبرەو کەوت.

نووسەر هەیە هەموو ژیانی خۆی بە نووسین بەخشیوەو بەچەندین کتێبی چاپکردون، لێ هێندەی ئامێرێکی مۆبایل ناسراو نییەو هێندەی مۆبایلێك بۆتە خەیاڵ‌و روئیای گەنجێك کتێبێك نەبۆتە بابەت بۆی! راستە لە هەموو وڵاتانی دنیادا ئەو شەپۆلە تەکنۆلۆژییە هەیەو هەمان دیاردەش هەنە، لێ لەهەمان کاتدا زۆربەی زۆری گەنجان

پاشخانێکی رۆشنبیریو خوێندنەوەیان هەیەو ئاگاداری دەرچوونی نوێترین رۆمانو داهێنانی ئەدەبین.

زمانی ئەدەبی لەو قۆناخەدا زمانێکی ماندووەو پەلوپۆیەکی فەرهەنگی قووڵ ناهاویو نوێ نابێتەوەو چەقی بەستووەو لەگەڵ بەرژەوەندی تاکەکەسی گرووپەکان ڕێدەکاو خۆ دەگونجێنی، بەو مانایەی زمانێك نییە بالاترو نموونەی تر پێناسەو تایبەتمەندی خۆی پاراستبێ دەگەڵ ئەو زمانە لەبارچووانەی ئەورۆ دەکاردەبرێن.

وەشانی زمان بە خەراپی بەرێگادان بە جێگیربوونی زمانی بەسەرچوو زمانی پیس، وەکو ئەو خواردەمەنییە ئێکسپایەرو بەسەرچووانە وایە، کە رۆژانە بە خەڵکی هەژار دەفرۆشریو دەبتە هۆی ژاراوی بوونو مردنیانو کەس لە قوربانییەکانی ناپرسێتەوە! لێ هەموو ئەو پرسە خەتەرانە بەهەند وەرناگیرێنو بەسەرماندا تێدەپەڕن.

دەبێ هەمووومان بزانین، کە زمان پەیوەندی گرنگو قووڵی هەیە (ئاسایشی نەتەوەیی) هەروەك چۆن خواردەمەنی یەکە لە بابەتەکانی ئاسایشی نەتەوەیی، زمانیش هەمان کاریگەری هەیەو بەدواداچوونو لێپرسینەوەو پارێزگاری لێکردنی ئەرکێکی نەتەوەییە، بەتایبەت بۆ نەتەوەیەکی وەکو کورد، کە تائێستا لە باکوری کوردستانێ لەسەنگەرەکانی زماندا شوڕش بەردەوامە.

هەروەها ئەو هەموو تێکشکانە روحیە بەسەر ئەو نەتەوەیەدا هاتووە، جێو کاریگەری خۆی هەبووەو بەجێهشتووەو بەسەر زمانی ئەدەبیو تێکشکاندنی، چونکە بەڕای من بزاوتنی زمان بەهەڵەو بەبێ

**لێپرسینەوە دەبتە هۆی تێکشکانی ئەو زمانەو وەکو ئەوەیە چەند مینێك لەماڵی خۆدا بچێنی..**

**لەبۆیە دەبێ خوێندنەوەی تایبەتمان بۆ زمان هەبێ وەکو هەر نەتەوەیەکی دیو زمانەکانمان لیك جودابکەینەوەو هەوڵدەین بۆدارشتنی سیاسەتی زمان.**

**لەهەموو کایە سیاسیو رۆشنبیریو مەعریفیەکاندا رەخنە دەرهاویشتەیەکە لە تۆکمەبوونی هەر بوارێكو یا بۆ پتر پێشکەوتنو تۆکمەبوونی هەر کایەیەك لەکایەکانی ژیانو، ئامرازێکیشە بۆ زیندوو راگرتنو پاراستنی ئەو کایەیە، رەخنە شێوازو زانستو کەرەستەو سنوورو ئامرازی تایبەت بە خۆی هەیەو دەبێ دەست بۆ بردنی وەکو ئەرکێك سەیربکرێ.**

**ئەگەر لە رەخنەی ئەدەبی بهزرین، دەبینینن ئەدەب بۆخۆی ئێستا لە قەیران دایەو، پەیوەندی بەو قۆناغەوە هەیە کە رۆشنبیری کورد پێیدا تێدەپەرێ.. ئەوەی ئێستا بەناوی رەخنەی ئەدەبی دەیبینین، زۆربەی زۆری جگە لە هەندەك پێداهەڵدانی حیزبی یا تێکشکانی روحی نەبێ هیچی تر نییە!**

**دەنا چەند رۆمانی باش بنووسەو بلاوبکەوە کێ باسی دەکا؟ بەدەیان وتاری پڕ ناوەرۆك بنووسە کێ دەیخوێنێتەوە؟ بێ لە چەند خوێنەری راستەقینە نەبێ، لێ ئەگەر رۆژانە لەسەر سایتو لاپەرەی هەندێك رۆژنامە بڕوانی، چۆن رێکلام بۆ هەندێك نووسەری بەرژەوەندی بۆ رۆیشتوو دەکرێو، وێنەو بابەتیان وەکو رێکلامی مۆبێل تەلەفۆن بە**

**ڕەنگاوڕەنگی بڵاودەکرێتەوەو دەوەشێنرێ، لەوە دەمەیدا چەندین نووسەری دانسقە هەنە لـە کوردسـتانو لـە تاراوگـە، کـەس بانگهێشـتی کـۆڕو سیمینارێکیان ناکاو گۆشەی ڕۆژنامەو گۆڤارێکیان بە شایان نـازانێ، چ جای ئەوەی گرنگی بە بابەتیان بدرێ لە بڵاوکردنەوەدا.**

## كورد لە هەڵدێرێكی نوێدا

لەو رۆژانەدا شەپۆلێكی مەیلەو مرداری بێئاگاییو وڕی بەسەر تاكی كورددا هەڵدەكشێ وكورد گەورەترین نەتەوەی بێدەوڵەتی سەر زەوییە لەسەدەی بیستو یەكدا، قەیران لە دوای قەیران بەسەر مێژووو بەسەر سیاسەتو بەسەر زمانو بەسەر رەوشتی كورداندا دەسەپێنرێ، هێندەك پرسی بە كاكڵەو بەئەمەك لێم ناگەڕێن كە چی دی بێدەنگبمو نەیەمە تێهزرینیان...

هەڵدێرەكانی كورد تێیان كەوتووە زۆرن هەر لە هەڵدێری فیكری تا هەڵدێری سیاسیو هەڵدێری مێژوویيو هەڵدێری ئابووریو هەڵدێری كۆمەڵایەتیو هەڵدێری فەرهەنگی كە پێشینەیەكی كولتووریيان هەیە، لەبەرهەندێ ئەگەر هەر تاكێكی خوێندەواری كورد بە چاوێكی تیژ لەدەوروبەری خۆ بڕوانی ئەو ڕوداوو گۆڕانكاریە خێراو نا سروشتیانە دەبینێو هەست پێدەكا كە بەدەورەماندا دەگوزەرێنو بوونەتە قەیران، قەیرانی سیاسیو قەیرانی كۆمەڵایەتیو قەیرانی ئابووریو رۆشنبیرییەكان بەدرێژایی مێژوو بە جۆرەها پلان رووبەڕووی كوردان

کراونەتەوە، لە بۆیە جێی سەرنجە لە پاش هاتنی ئەمەریکا بۆ کوردستان وردترو هۆشیاتر لەو قۆناغە ڕامێنین‌و تێی بهزرین...

ئەوکات بۆمان وەدەردەکەوی کە کوردستان بەری لە ژێر پرۆسەی چەپاندنێکی سەرتاسەریدا بووە، وەکو چەپاندنی سیاسی‌و چەپاندنی مێژوویی‌و چەپاندنی ئابووری‌و چەپاندنی کۆمەڵایەتی‌و چەپاندنی رۆشنبیری، بەر لەو چەپاندنە فیکرییەی بە درێژایی مێژوو هەموو کایەکانی ژیانی کوردی پەستاوتوەو بەدرێژایی مێژوو هەر پشتی بە دەوڵەتان بەستووەو متمانەی بە هەموو ئەوانە کردوە کە دەستیان بۆ درێژ کردوە..

چەپاندنی سیاسی: ڕەهەندێکی هەندە قووڵە کە ڕۆبچینە ناوی دەبێ هەموو شۆڕش‌و ڕاپەرین‌و خەباتی نەتەوەی کورد بەر خوێندنەوەیەکی وردو قۆناغ بە قۆناغی هەڵگێڕو وەرگێڕ بکەین‌و بەسەرلەبەری ئەو مێژووەیدا بچینەوە کە ئەویش بەبەر پرۆسەی چەپاندنێ خراوە..

لەهەمووان ئاشکرایە تا بەر لە هاتنی ئەمەریکاو روخانی رژێمی بەعسی لە کۆی سی ساڵی ڕابردوودا تەنها ساڵی نەوەدویەك نەبێ کورد وەکو پەراویزێکی گچکە جار بە جار ئاماژەی پیدەکرا .. چەپاندنی سیاسی.نەتەوەی کورد بەپلانی وردو نەخشە بۆ کێشراو هەتا ئەو کاتەی پێویست دەکا، کورد لە پاش قۆناغی شۆڕشی چەکداری زۆر بە کەمی بنەمایەکی تۆکمەو زانستی بۆ سیاسەت هەبووەو لەسەر ستراتیژایکی بەبنەما هەنگاوی سیاسی نەناوە تەنها لەو کاتانە نەبێ کەکەوتۆتە ناو تەنگانەو مەترسیەوە کت وپڕ هەنگاوی هەڕەمەکی سیاسی هەڵێناوە..

کاتی ئەوە هاتووە کورد دەسبەرداری ئەو هەرەمەکیە سیاسیە ببێ‌و زانستی سیاسەت بەهەند وەرگرێ لە رووداوو پێشهاتانەی پەیوەندیان بە چارەنووسی نەتەوەیییەوە هەیەو بە دیدێکی رەخنەیی لەو چەپاندنە سیاسییەی قوولْ ببێتەوەو بزانێ چەپاندنە سیاسییەکەی بە شێوازێکی (مەتاتی) بووەو کاری لەسەر کراوە بەچەند ستراتیژێکی فرەرەهەند لەهەر یەك لە قۆناغەکانی شۆرش‌و راپەرین‌و خەباتی سیاسیدا لەهەلْدێرێکی سیاسی کەوتووە..

جێی خۆیەتی لێرەرا بەهەندەك سەرنجان رۆچمە ناو ئەو هەلْدێرە سیاسییە. زۆر مرۆڤ هەنە سیاسەت دروست دەکەن، زۆر سیاسەتیش هەنە مرۆڤ دروست دەکەن، کولتووری سیاسی هەر نەتەوەیەك جیاوازە لە کولتووری سیاسی هەر نەتەوەیەکی دی بێ لە خالْی وێکچونیان.

زۆر مرۆڤ بە رێکەوت لەئەنجامی کردارێك دەبنە سیاسییەکی گەورەو ناو دەردەکەن، هەندەکی دی تا دەمرن خۆ بەسیاسەتەوە خەریك دەکەن لێ نابنە سیاسی، زۆر کەس دەلْێن سیاسەت زمانێکی زۆر دەکاربراوو دلْێکی فراوان‌و جەستەیەکی چەند رووی پێدەوێ، لێ زۆر مرۆ هەنە هەر زمانیان لە زاریدا نییەو دلْیان لە سینگیدا نییەو سەری خۆیان بەسەر ملیاندا بەرداوەتەوەو لێ بە سیاسیش ناوزەدەکرێن‌و دەچنە ناو مێژووی سیاسییەوە.

لەنێو نەتەوە دواکەوتووەکاندا سیاسەت فەرهەنگێکە ناوی هەموو تاکێکی تێدایەو ماناو پێناسی هەموو هاولاتیەکی تێدا دەدۆزیەوە، زۆربەی هەرە زۆری رۆشنبیرەکان نایانەوێ دلْی سیاسییەکان بشکێنن،

ئەدیبەکان تەنها بە بەژنو باڵای سیاسییەکاندا هەڵدەڵێن، مێژوونووسەکان سەرکەوتنەکانیان بۆ تۆماردەکەن رۆژنامەنووسەکان سنوورەکانیان نابەزێننو هەر وەختەك سیاسەت مەبەستی بێت قەڵەم بە نووسەرو رۆشنبیرەکان فڕێ دەداو کەناڵێکی تایبەتیان دەداتێ، کامێرا بە رۆژنامەنووسان وەلادەنێو کەناڵێکیان دەداتێ.

کۆمەڵگا هەن سیاسەت وەکی پەتا پێیان وەربوەو هاوڵاتیانی نازانن تەمەنیان چۆن دەگوزەرێنن، بازرگانەکانی هەر سیاسین، پیشەکارەکانی هەر بۆ سیاسەت دەکوتن، تیکڕای ژنەکانی مەیلی چوونە ناو سیاسەتیان هەیە، هەموو جوتیارو بێکارو هەژارەکانیشیان ڕوودەکەنە دەزگاکانی دەوڵەت دەبنە پۆلیسو ئاسایشو پاسەوانو مووچەخۆر.

لەسەدا هەشتای هاوڵاتیانی حیزبو حکومەت بەپەناگەو قەرزباری خۆ دەزاننو لەسەدا پەنجایان پتر خەونی بوونە وەزیریان هەیە، نیوەکەی تریان ڕاویژکارو بەڕێوەبەری گشتیو لەسەدا چلیان هەموو ببنە خودان بڕوانامەی دوکتۆراو ئەوانەی دیکەش تێکڕا ببنە موچەخۆرو لەدەزگایەکانی پۆلیس، تاکە کەسەك نامێنی بە ژیانو پیشەی خۆ ڕازی بێو خەون بە سیاسیبوونی خۆیەوە نەبینێ.

سیاسەت بێ لەوەی هەڵدێرێکی قووڵە هەڵدێری ورد وردیشی زۆر تێدا هەنە، کە یەك لەوان هەڵدێری زمانە.

١٥/٨/٢٠٠٦ هەولێر

# کوشتنه مەدەنییەکانی ژنان و
# کاریگەری بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی

(دەبێ ژنە مافگێڕەکان بزانن کوشتنی ژنان شێوازی گەلەك خەمهێنەری هەن و، لەژێر ناوی جودا جوداو بە شێوازی جیاواز پیادە دەکرێ، کە یەك لە وان بازرگانی کردنە بە ناوی ژنان لە ژێر نمایشی کوشتن لەسەر شەرەف و توندوتیژیدا).

پرسی یەکسان بوونی ژنان و زامنکردنی ئاسایش بەهەموو مانایەکانیەوە تا حاڵی حازریش یەکە لە لەو پرسە جێی مشتومڕانەی کە دەکەوێتە ترۆپکی گفوگۆی سیاسەت داڕێژەران و سکۆلارە بە توانایەکان لە پێشکەوتووترین وولاتانی دنیادا بۆ نموونە گەلێك لە فێمێنیزمە مۆدێرنەکان نیگەرانی دەرئەنجامەکانی گلۆبالیزەیشین کە چۆن و بە شێوەکی خێراو داپۆشراو ئاسایشی ئابووری ژنان لە دنیا دەخاتە ژێر مەترسییەکی گەورەوە.

دەکرێ بە یەك لە تاریفەکانی ژن کوشتن یا توندوتیژی بلێین کوشتنی مەدەنی، چونکە سەرمایەداری هەتا زیاتر پەلوپۆ بهاوێ مرۆڤ زیاتر دەبێتە سووتەمەنی بە تایبەت ژنان لە ولاتانی دەسەلاتداردا، بۆیە هەتا ژیان پێشبکەوێ شێوازەکانی چەوساندوەش لەگەڵی پێشدەکەون بە

فۆرمی نوێو، ژنان لـه خـەباتی بەردەوامـدان تـا بـه شـێوەی مـۆدێرن نەچەوسێنەوە.

له کۆبوونەوەی وڵاتانی G۲۰ ڕاپۆرتێك لەسەر باری خـەراپی ژنـانو توندوتیژی بەرامبەر ژنان هاتووە ئاماژە بەو نەهامەتیانه دەدا، که ژنـان لەو وڵاتانەدا ڕووبەڕووی دەبنەوە، جێی سەرسوڕمانێ نییه ئەگەر دەبیـنن (له ساڵی ۲۰۱۲ لـه پـاش ئـەوەی ٤٠ سـاڵ بەسـەر یەکسـان بـوونی مووچەی ژنانو پیاوان بۆ یەك جۆره کارو بە درێـژای هـەمان کاتـژمێر، بەڵام له ساڵی ۲۰۱۲ دا جیاوازی نێوان مووچەی ژنانو پیاوان بۆ هەمان جۆره کار، درێـژایی کاتـژمێری کـار لـه بـەریتانیادا ٪۱۸یـەو وڵاتـی بەریتانیا له نایەکسـانی مووچـه لـه لوتکـه دایـه بەرامبـەر وڵاتـانی ئەوروپا)، هەروەها له وڵاتی فەرەنسا تا چەند ساڵێك لەمەوبەر بۆشـایی ئەو نایەکسانییه ٪۲۲ بوو، بەڵام له سـاڵی ۲۰۱۲دا دابەزیوەتـه ٪۱٦، هەروەها له وڵاتی ژاپۆن ئەو جیاوازییـه دەگاتـه ٪۲۸ بەشـەرتێك ژنـان کاتژمێری کاریشیان درێژترەو کاری گەلێك سـەختتر لـه پیـاوان ئـەنجام دەدەن بـه تایبـەت لـه بـواری تـەکنۆلۆجیا، سـەرەڕای کـاری مـاڵو بەخێوکردنی خێزان، بەڵام له کۆریای باشوور ئەو ڕێژەیه هەڵدەکشی بـۆ ٪۳۸ له کەرتی تایبەتو کـەرتی گشـتیدا، کـه ژنـان لـه گـەورەترین کێشەی مۆڵەتی دایکایەتیدا دەچەوسێنەوە، هەڵبەتـه تـەواوی ڕێـژەکان خەمهێنەرن، بەڵام لێردا بوار نییه ئاماژە به هـەر ۲۰ وڵات بکـەم، لـه دووماهیدا سەرنج دەگەڕێنمەوە سەر ژنانی ئەمەریکی کـه پـتر لـه ۲۲

ملیۆن له ژنانی ئەمەریکی مافی پاراستنی تەندروستیان نییە ( us census٢٠١٢ )

له هەرێمی کوردستان کۆکردنەوەو چڕککردنەوەی هەموو مافەکانی ژنان بەتەنها له قالبی کوشتن لەسەر شەرەف شێوازێکی تره له کوشتنیٚ ژنان، بۆ نموونه هەتا ئێستا ژن هێزی کار نییه له کۆمەڵگەی ئێمەدا، بەڵام بۆ کۆنفرانس‌و هەفتەی تایبەت بۆ ئەو پرسه نایەته سازدان!!! پرسیار ئەوەیه بۆ زورنالیێدەرانی توندوتیژی له رۆژهەڵاتی ناوەڕاست نا له رۆژهەڵاتی ئاسیاش نا، بەڵام بۆ باسی قوربانیانی توندوتیژی له ئەورووپاو بەریتانیا ناکەن، ئایا سەرەڕای ئەو سزا یاساییە توندانەی لەو وڵاتانەدا هەیه توندوتیژی هەر بەردەوام نییه؟!

یان ئەوان جاری ئەوە دەدەن که ژنی کورد تاکه قوربانییه له سەرانسەری دنیاداو ژیانی زۆر خەتەرتره له ژنانی ئەفغانستان؟! ئەز دەپرسم مانگی چەند ژن له ژنه خودان بڕوانامەو ژنه چینی باڵایەکان له هەولێرو سلێمانی دەکوژرێن؟! یا ئەو بەدبەختانەی دەکەونه ئەو کەمینانه هەر ژنانی بێدەسەڵات له شارۆچکەو دێهاتەکانن بەو چارەنووسه دەگەن!!؟ نموونەیەکی دی ئەوەی جێی تێڕامانه بۆ کەس باسی مافی ئەو ژنه کریکارانه ناکات که له کۆمپانیا بیانییەکان کرێکارن‌و هیچ یاسایەکیش نیه بۆ پاراستنی مافەکانیان خاوەن کار هەردەم دڵی بخوازیٚ دەریان دەکات بەبیٚ هیچ پشتیوانییەکی یاسایی؟!

لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵگا شێوازی توندوتیژی‌و تاوانەکانیش پێشدەکەویٚ‌و توندوتیژیش لەهەموو وڵاتانی پێشکەوتووی دنیا

بەبەردەوامی پیادە دەکرێ، ژن کوشتن ئەو ژانە قوولەی جێگەی ژانو تێفکرینە لەنێو هەر کۆمەڵگەیەکداو تاوانێکی هێندە چەپەڵە کە جێگەی پاساو نیە، لێرەدا ئەگەر ئاوڕێکی مێژوویی بۆ ئەو جۆرە تاوانە بدەینەوە هەست دەکەین ئەو جۆرە تاوانانە لە وڵاتانی پێشکەوتووی وەك بەریتانیا پیادەکراوە، بۆ نموونە لەسەرەتای ساڵانی شەستەکاندا لە بەریتانیا ژن بە تاوانی شەرەف دەکوژرا، هەرەها لە حاڵی حازریش مانگ نییە کەیسێکی توندوتیژی (توندوتیژی بەهەر شێوازێك هەروەها کوشتنیش بە جۆرەها شێوازو کەرەستە) لە یەك لە دادگایەکانی بەریتانیادا نەبێ.

هەر لەساڵی ٢٠١٠دا لە دۆکیمینتێکی (میترۆپۆلیتیان پۆلیس)دا هاتووە کە نزیکەی هەشتا ژن بە شێوازی جودا لەلایەن مێردی پێشوو و دەزگیرانی پێشویانەوە هاتوونە کوشتن، بەڵام لەبەر جیاوازی کولتووریو ئاینی شێوازی ئەو جۆرە کوشتنو توندوتیژیانە لەوڵاتانی جیهانی سێدا زۆر بەهێزەو شیوازەکانیشی هەمەجۆرە.

پرسی ژنی کورد ئێستا لە ترۆپکی بە کاڵابوونو بە بازاڕبوونێکی بێ هەژماردایە، چۆن لەپڕ کۆمپانیا بە رێژنە بە سەر کوردستانێکی بێ ژێرخانی ئابووری داباریونو گۆڕانکاریەکی بە زەبرەیان لەژیانی ئابووریو کۆمەڵایەتی خەڵکی بێدەرامەت سرەواند، بەهەمان تەوژمیش ناوی ژن بەمانشێنت گەڕێنراوەو ڕێکخراوو سەنتەرو دەزگا بەسەر ژیانی ژنی بێ ژێرخانی ئابووریو فیکریو خویندەواریدا هەڵتۆقینو ژنی کورد بە رووو نیگارو مێژوویەکی هەڵتەکێنراوو هەتکراو لە میدیایەکانی دەوروبەرو

دنیادا دەوەشێنرێ. ژنی کورد بە شـیوازێك لـە میدیەکانـدا بانگەشـەی بۆدەکرێ کە لە ژێر فشارێکی گەورەی کوشتنو توندو تیژیدا دەدژی، هەر لەهەمان کاتیشدا ئەگەر ئامارێکی زێرِ کرِینی ژنانی کوردستان ببـینی تووشی سەرسورِمانێ دەبـی!! هـەروەها دەبێـت رامیـنین لـەوەی ئایـا چ بۆشاییەكو جیاوازیەك هەیە لـە مابـەینی موچـەی ژنـانو پیـاوان لـە کوردستان؟! ئەگەر هەیە بۆ نابیتە جێی باسو کۆنفرانس؟!

ئەدی ئەگەر ئارایشـگاو فرِۆکەخانـەو ریسـتورانو مۆڵـەکان سـەیر بکەی، دەبینی ژنان بەشێوازو ستایلێکی کراوە جمـەیان دێ، هـەر مـاوە ماوەش بەناو سیمینارو کۆنفرانسو کۆبوونەوە لە ژێر دروشمی توندوتیژی سازدەدرێنو پۆلە ژنێك بە تەنیا جارِی داخوازیـەکانی خۆیـان بـە نـاوی هـەموو ژنـانی کـوردەو بـۆ میـدیاکان رِادەنـێن!! ئـەڤ ژنـە خـۆ بـە بلیمەتزانانەی کـورد هـەموو کێشـەی ژنـی کوردیـان چـرِکردۆتەوە لـە کێشەی کوشتن لەسەر شەرِەف، لێرەدا من مەبەستم ئەوە نییە بێژم ئـەوە کێشە نییە، بەلاّم مەبەستمە بلێم بـا چـیدی کاسبـی بـەو کێشـەیەوە نەکرێ هەر لەهەمان کاتیشدا ژنی کورد جۆرەها کێشەی دی رِووبەرِووی دەبێتەو یەك لەوانە نەخویندەوارییـە نـەك بەمەبەسـتی بەدەسـتهێنانی برِوانامە، بەڵکو بە مەبەستی بەرزکرنەوەی ئاستی رۆشنبیریان!

ئەگەر بەتەنها لەسوچێك رِا سەرنج باوێنە سەر دیوێکی ژیـانی ژنـی کورد بێ لەو پۆلـە ژنـە پـانتۆڵ لـەپێو تـەنورە هـەڵتریزاوو ئـالۆوالاو رِەنگێنراوانەی رِووی میدیاکانیاندا تەنیوە دەنا زۆربەی زۆری ژنـی کـورد لەناو هەلاّواردنێکی کولتووریدا دەژینو لەگشتی بوونی هـەموو مـافو

ئەرکەکانیدا لە هەموو بوارەکانی ژیانیدا دابڕێنراوەو وەلانراوە. بۆ نموونە هەتا ئێستا ژن هێزی کار نییە لەو هەرێمە دەوڵەمەندەدا! هەروەها ڕۆلی ژن وەکو دایك جا بە هەموو ئەرکە قورسەکانیەوە هەر بابەتیك نیە باس بکریّ!

ژنان لەبەر هەستیاریو ناسکی باری دەروونیان پتر لە پیاوان تووشی تێکچوونی باری دەروونی دەبن هەموو ڕووداوو کردارو دەنگو پەیوەندییەك زۆر بەڕاستەوخۆیی کاردەکاتە سەریانو دەیانهەژێنیّو کاریگەرییەکانی لەسەر دەروونیان دەچەسپێنیّو بەجێدەهێڵیّ، ئەگەر سەرنجێکی چڕ باوێینە سەر بارودۆخی دەروونی ژنی کورد لەو قۆناخەی ئێستادا گەلەك بە ڕوونی ئەو تێکشکانو تێکچڕاژانە دەبینینن، کە بەدرێژایی ساڵانێك لەشەڕو قڕکردنو شەڕی براکوژیدا بەسەری هاتووەو لەتەواوی ئەجیندا سیاسیو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریو ئابوورییەکاندا پەرتەوازەکراوەو ژیانی داشۆڕاوە لە مافو خزمەتگوزاری تەندروستیو پەروەردەییو یاسایی.

حەتمەن لێرەدا مەبەستم لە تێکڕای چینو توێژەکانی ژنە لەهەر قوژبنو شارۆچکەو دێهاتێکی کوردستانیّ بەدەر لەو کۆمەڵە ژنو گرووپانەی لە چوارچێوەی باڵەخانەو شارو هۆڵە گەورەکاندا چالاکیەکانیان دەنوێننو ژێر ناوی ئافرەتی کورد داوای کۆمەڵە مافێکی بەدروشم بوو دەکەن، لەودەمەیدا کۆمەڵە مافو خزمەتگوزاریەکی بنەڕەتی هەن هەر فەرامۆشکراون، بۆ نموونە خزمەتگوزاریە تەندروستییەکان.!!

لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بەو گۆڕانکارییە سیاسییو کۆمەڵایەتییە چڕانە بکەین، کە پاش ساڵی دوو هەزارو سێ هاتنە ئاراوەو ژیانی ژنانیشی هێنایە گۆڕینێ، ژنانێك کەوتنە خۆ یا دەستیان گیراو هێنرانە مەیدانو هەڵتۆقینو کرانە بەشێك لەو مۆدیلە مەدەنییەی ئەورۆ لەکوردستان نەخشەی بۆ کێشراوەو بەجۆرەها شێواز ڕێکخراوو سەنتەریان بەسەردا دابەشکردن بەناوی مەدەنیو یەکسانیو چاودێریو ئازادیو چەندین ناوونیشانی تر، هەتا لەهەرسێك پارێزگای کوردستاندا نزیکەی شەستو سێ ڕێکخراوو سەنتەرو دەزگاو دامەزراو بۆ داکۆکیکردنو پێشخستنو پارایزگاریکردن لەمافەکانی ژنان دامەزران، بێ لەوەی هەندێکیان بە بەردەوامیو بە پێی توانای خۆیان کاردەکەن لێ هەندێکیان بازرگانی بە خوێنو ناوو سیمای ژنانەوە دەکەن..

هەموو خویندنەوەو شێوازی خەباتو دروشمو فێمینستیایەتییەکەیان بەبەراوەژوویی وەرگرتوەو بەهەڕەمەکی هەرکەس لەبەرخۆوە کۆمەڵە ژنێکی کردووەتە کاڵاو دەخیلەکانی خۆی پێ پڕدەکا!!

بازرگانی کردن بە خوێنو ناوو سیمای ژنان گەیوەتە ئەو ئاستەو وەها بە بەربڵاوی لەگەشدایە، کە دەکرێ پێی ببێژێ کوژرانە مەدەنییەکانی ژنان، ئەو شێوازی کوشتنانە زۆرن لێ ناوو باڵەخانەو ناونیشانەکانیان جیاوازن، ئەگەر نا چۆن لەسێ پارێزگادا ژنان لەسەدا بیستو پێنجی پشکیان لە دەسەڵاتی سیاسی پێبڕاوەو شەستو شەش ڕێکخراوو سەنتەری داکۆکیکەر لە مافی ژنان هەیە، لێ تاکە بنکەو دامەزراوێکی تەندروستی دەروونی کە پێی دەڵێن (شێتخانەی ژنان) لە کوردستاندا

**نییە؟ جگە لە نەخۆشخانەی سۆز کە ماوەیەکە دامەزراوە، کەسێك نییە بەبایەخەوە ئەو خەمە هەڵگرێو کاری بۆ بکا! تا ئێستاش ئەو ژنو کیژانەی دووچاری تێکچوونی باری دەروونی دەبنو بەشێت ناوزەد دەکرێن، لەناو ماڵو ژێر زەمینەکاندا بە زنجیرو گوریس دەیانبەستنەوە تا پیر دەبن، ژیانی چەند ئافرەتێکی تر چ دایكو چ خوشکیان لەگەڵیان تێکدەچێو دوچاری هەمان نەخۆشی دەبنو دەکەونە ژیانێکی پڕدەردەسەریو وێران، دەبێ هەموو دەمێ لەبیرمان نەچێ ولاتێك بەدرێژایی مێژوو مەیدانی جۆرەها شەڕی دەرەکیو ناوخۆ بووبێو باجدەری گەورەی ژنەکانی بووبن، چۆن تێکڕای ئەو ژنانە خودان تەندروستییەکی دەروونی ساغو لەبارن؟**

**بەپێی ئەو زانیاریانەی لەسەر ئەو حاڵەتانە وەدەستم کەوتوون بەتەنها لە کۆمەڵەی بیرکۆلانی کوردستان لە شاری هەولێر تا ئێستا هەشت سەت ٨٠٠ حاڵەتی ئەوها تۆمارکراوە، هەڵبەتە بەبێ بوونی هیچ جێگایەكو بە موچەیەکی کەمو بەبێ بوونی هیچ خزمەتگوزاریەك، بێ لەو ژنە کەساسانەی دەستیان بەهیچ جێگایەك ڕانەگەیشتوەو لە کوختەو ژێرخانی ماڵەکاندا دەتلێنەوەو هەندێکیان دەستدرێژیان دەکرێتە سەرو ئەشکەنجە دەدرێن، جۆرەها پێشێلکاریان بەرامبەر دەکرێ! بێ لەجۆرەها حاڵەتی تری نەخۆشی دەروونیو مێشك وگەلەك نەخۆشی دیکە، سەرەڕای بوونی وەزارەتێكو چەندەها یاسای تایبەت لەبۆ بواری تەندروستی، بەرێ هەرچی بەسەرمان هاتووەو تێپەڕی بەدەستی داگیرکەرانی کورد بوو، لێ ئێستا دەبێ هەموومان بزانین تەندروستی**

یەکە لە رەگەزە گرنگەکانی ئاسایشی نەتەوەیی‌و جێی بایەخ پێدانی سەرەکیە بۆ هەر نەتەوەیەك، نەوەکو بەتەنها هەر خەریکی دارشتن‌و رازاندنەوەی یاسای جوان بین وەکو دروشمگەلێك بۆ نموونە لە پرۆژەی* دەستوری کوردستاندا لەدەروازەی دووەم ناو مافە مەدەنی‌و سیاسیەکاندا بەسێ مادە ئاماژەی پێکراوە:

ماددەی: ٥٠

هەموو هاولاتییەك مافی چاودێری تەندروستی هەیەو دەبێ حکومەتی هەرێم شێوازی پارێزگاریکردن‌و چارەسەرکردنی دەستەبەربکات‌و بە گوێرەی تواناشی، مافی ئەو کەسانە دابین دەکات کە بە هۆی بارودۆخێکەوە کە لە دەستخۆیاندا نەبووە، سەرچاوەی بژێوییان لە دەستداوەو لە حالەتی نەخۆشی‌و پەککەوتەیی‌و پیریەتی‌و بێوەژنی‌و بێوەمێردیدا.

ماددەی:٥١

یەکەم: حکومەتی هەرێم پابەندە بە بایەخدان بە تەندروستی گشتی، بە دروستکردنی نەخۆشخانەو دامەزراوە تەندروستییەکان‌و خانەی چاودێری کۆمەلایەتی بۆ بەسالاچوان‌و، شێوازی خۆپاراستن‌و چارەسەرکردنیش دەستەبەر دەکات.

دووەم: تاکە کەس‌و دەزگا ئەهلییەکان دەتوانن نەخۆشخانەو خانەی چارەسەری تایبەت دروست بکەن لەژێر چاودێری دەزگا تایبەتمەندەکانی حکومەتی هەرێم، ئەوەش بە یاسا رێکدەخرێت.

ماددەی:٥٢

یەکەم: کەمئەندام مافێکی ڕەسەنی خۆیەتی کە ڕێز لە مرۆڤایەتیی بگیرێت، هەروەها هەرچییەك هۆی کەمئەندامبوونی بێت و لەهەر ئاستێکدا بێت، هەمان ئەو مافە بنەڕەتیانەی هاولاتیانی هاوتەمەنی خۆی هەیەو، مافی خۆیەتی ژیانێکی شایستە کە بەپێی توانا سروشتی بێت، بەسەر بەرێت.

دووەم: کەم ئەندام مافی چارەسەرکردنی پزیشکیو دەروونیو فێربوونو دامەزراندنو سوودوەرگرتن لە ئەندامی دروستکراوو ئامێری توانابەخشو هەموو ئەو شتانەی هەیەو پەرە بە تواناو لێهاتوویی دەدەن.

دەبێ ئەو دەقو پرۆژەو یاسایانە ببنە جێی سەرنجێ، چونکە بە دیوێکدا هەر بەتەنها ئەو پرۆژە دەستوریە نا، بەڵکو لە ناوەرۆکی گەلێك یاسادا لەسەردەمی رژێمی بەعسیشدا زۆر بە شارەزایی ڕۆچوونەتە ناو هەموو لایەنێکی ژیان، لێ نە کاریان پێکراوەو دەکرێ، نە هاولاتیانیش هۆشیار لێخەفتینیان هەیە، نە هۆشیاری لێ پێچینەوەیان بەتایبەتی ژنان، بە دیوەکی دیدا بەتەنها ئەو جۆرە یاساو پرۆژە بۆ دروشمەکانی مافی مرۆڤو دیموکراسی دادەڕێژرێن.

لێرە ڕادەمێنین لەوەی لە ناوەڕاستی ئەو هەموو ژنە خۆ بە مەدەنی زانانەو داهێنەری مافانەدا کە دووسێ ساڵە چەند ژنێك پلەی دادوەریو داواکاری گشتییان پێدراوە؟ لەناو زیندانی هەموو شارو شارۆچکەو گوندەکان لە زۆربەی زۆری زیندانی هەر بنکەیەکی پۆلیس بەتەنها بۆ پیاوانەو ئەگەر هەر ژنێك بە تاوانێك بەند بکرێت ژوورێك یا جێگایەکی تایبەتی بۆ دیاری نەکراوە کە تێیدا بمێنێتەوە تاوەکو لێکۆڵینەوەی

لەگەڵ دەکرێتو دەنێردرێتە دادگا، ئەگەر هەشبێت ئەوە کوختەکی بەدەر لە خزمەتگوزاریە، بێ لە بنکەی چاکسازی کۆمەڵایەتیانەی پاش حوکمدان دەنێرێنە ناوی وەکو زیندان، کە لەناو ئەویشدا ڕووبەڕووی چەندین پێشێلکاری تر دێن، کە لێرە مەودای لێکۆڵینەوەی نییە، لەبۆیە ئەمن دەپرسم ئایا ئەوە مافێکی زۆر سەرەکی ژنان نییە؟ یا جارێ مافەکانی لەش ڕەهاکردنو پۆشینی بەرگی ڕووت پارەیان پێ پەیدا دەکرێ!

یا ژیانو پەرەپێدانی خزمەتگوزاریو تەندروستی دەروونیو جەستەییان گرنگ نیەو بابەتی ڕێکخراوە بیانییەکان نییە وەکو خەتەنەکردنی کیژان ببێتە مانشێتو پارەی لە حکومەتو دەزگا ئەمەریکیو ڕێکخراوە بیانییەکان پێ بچنرێتەوە؟ ببێتە باسو لێکۆڵینەوە لە پەرلەمان!

هەروەها لەباوەشی ئەو هەموو ژنە مافگێرانەدا ڕۆژانە بە دەیان ژنو منداڵی ئاوارەی بەشەکانی دیکەی کوردستان لە کەمپەکانی مەخمورو کاوەدا ناچاری جۆرەها کاری قورسن، تەنها بۆ ئەوەی دووچاری لەشفرۆشی نەبن!

وەختێك وڵاتێك جاڕی مەدەنیەتو دیموکراسیەت دەدا دەبێ بایی ئەوەندە ئاگاداری ژیانی ئابووری هاوڵاتیانی بێ بەتایبەت ژنو منداڵ ڕوو لەسەرگوێلکەکان نەکەن وەکو دوا پەناگە! لەهەمان کاتیشدا چەندین ڕیکەوتنی نەوت فرۆشتن ئیمزادەکرێو بانگهێشتی دەیان کۆمپانیا دەکرێ بۆ بازرگانی! کۆنگرەو کۆنفرانسی نێونەتەوەیی ژنی کورد دەبەسترێ!

بەڵام دیارە تـا ئێسـتا ئـەو بابەتـەش جێـی سـەرنجی سـازدەرانی کـۆڕو کۆنفرانسەکان نییەو، پرسی سەرەکی لێرەدا ئەوەیـە کـێن ئـەو ژنانـەی بەشداری ئەوان شۆیان دەکەن بە جلکی ئالاّوالاّوە یـا ئـەو خانمـە نیمچـە ئەوروپانشـینانە، کێهـەیان توندوتیـژیان بەرامبـەر دەکـری؟ هـەر بـۆ وەبیرهێنانەوە لە یەك لەو نمایشانەی بۆ توندوتیژی سازدرابوو ژنێکی خـۆ بە مەدەنی زان هاواری ئەوەی کرد کـە دەی ژنـانی کـورد کـاتی ئەوەیـە ئاوەلکراسەکانتان، جلکـەکانتان فـڕێ بـدەن بـا ئێـوەش ببنـە ژنێکـی پێشکەوتوو مۆدێرن! جا سەیر ئەوەیە ئەو خانمە بێ ئەوەی ئاگای لەوە بێ کە ژنانی ئێرانی لەگەڵ ئەوەی حیجابیش دەپۆشن، بەلاّم بە یەك لـە ژنـە چالاکەکانی رۆژهەلاّتی نـاوین دەژمێـردرین، هـەروەها لـە بـەریتانیاش گەلەك ژنی چالاك‌و هەڵسوڕێنەر بالاّپۆشن، ئەوە پەیوەندی بـە ئـازادی‌و بیروبـاوەری ئـەو مرۆڤـەوە هەیـە نـەك بـەو ئاراسـتە نادروسـتەی ژنـە مافبەخشەکانی کوردستان پیانوایە ژنـانی بـالاّپۆش ژنـانی تێکۆشـەرو چالاك نین!

دابینکردنی ئاسایشـی دەروونـی زۆر گرنگـە بـۆ دایکـان لـە کـاتی منداڵبوونـدا، بـەلاّم تـا ئێسـتا ژنـان لـە نەخۆشـخانە حکومیەکانـدا ڕوبەڕووی پێشێلکاری ڕوحی‌و جەستەیی دەبنـەوە، لـە نەخۆشـخانەکانی منداڵبوونێ لەکاتی منداڵبوونێدا، بۆیە دەکرێ بڵـێن ئـەوە توندوتیـژی دەروونییە بەرامبەر ژنان دەکرێ، زۆربـەی کاتـەکانیش لەلایـەن ژنانـەوە ئەنجام دەدرێ بە سیفەتی نوژدارو پەرستار، تا ئێستاش لـە زۆر گونـدان

ژن لەدەمی منداڵبووندا دەمرن لەبەر نەبوونی نەخۆشخانەی تایبەت بە منداڵبوونو نۆژداری تایبەت!

لێ پێدەچێ ئەو حاڵەتانەش بە ماف حسێب نەکرێنو خەتەرێك نەبن بۆ لەناوچوونو گیاندانو مردنی ژن! یا ئەو مۆدەی نییەو وەکو لێخورێنی ئۆتۆمبێلو خودانە گۆڕینی ئەدگارو شێوەی لەشو دەمووچاوو گۆڕینی کەلوپەلی ماڵەکانیان! دابینکردنی ئەو ئاسایشە بۆ ژنان ئەرکێکی گەورەیە ئەوە دەبێت ببێتە جێی کۆنفرانسو هەفتەی تایبەت، بەڵام ئەو ژنانەی دەمڕاستی بە مافی ژنانەوە دەکەن خوێندەوار نینەو تەنها بەشێوەیەکی سادە خویان بەو ناوبانگە گەورانە گرتووە تا ناوی خۆیان دەربکەن...

لێرە جێی خۆیەتی بێژین شێوازو کەرەستەکانی ژن کوشتنێ چەندە زۆرن لێ ئەوانەی نەکراونەتە دروشمی گەورەو جێی بازرگانیە نین بۆیە فەرامۆش دەکرێنو گلێیان وەسەر دەدرێ! دەبێ ژنە مافگێرەکانی بزانن کوشتنی ژنان شێوازی گەلەك خەمهێنەری هەنو لەژێر ناوی جوداجودادا پیادە دەکرێ.

سڵاوی گەرمیشم بۆ هەموو ئەو ژنە تێکۆشەرانەی لەپەراوێزی ئەو بازارە بە مۆدە کراوەدا بە خوێنی خۆیان بۆ ژیان دەجەنگنو هەڵدراونەتە ئاقاری شێتخانە مەدەنییەکانی ئەو سەردەمەی ژنی کورد، چاوی تێکڕای ئەو ژنو کیژانە ماچ دەکەم کە لەبەر بێکەسیو بێ خزمەتگوزاری تەندروستی کۆمەڵگە بە شێتی ناوزەدکردونو فڕێی داونەتە دەرەوەی ژیانو بەکەسەرەوە سەردەنێنەوە، دڵنیام ئەوان زۆر ئاقڵترو بە ویژدانترن

لەوانەی بەناوی ئەوانەوە ماف بۆ خۆو کەسوکاریان دەستێننو بازرگانی بەناوی ژنی کوردەوە دەکەن. هەروەها لەسەر سەرۆکایەتی حکومەتیش پێویستە لەپێش سازدانی هەر کۆنفرانسو کۆبونەوەیەك ڕاگەیاندێکی گەورە چ نەبێ دیراساتی دەوڵەتانی دەوروبەر بکا بۆ نموونە لەسەر دۆخی ژنانو توندوتیژی، چونکە ڕاگەیاندنی کۆنفرانسی توندوتیژی ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە لە سیستەمی ئەو دەوڵەتەدا کەموکورتیەکی دیراسە بۆکراو هەیە لەلایەن چەندین ئەکادیمیو پسپۆرانی شارەزا لە زانکۆیەکان، ئەو جار ئێمە دەبێ بپرسین ئایا کێ هەڵسوڕێنەری ئەو سینارۆیەیە؟ ئایا کێ بوون بەشداربووەکانی؟ ئایا ئەوە لەبەرژەوەندی کێ دایە ؟ من دەپرسم ئایا لە وڵاتە هەرە پێگەیشتووەکانی دنیایەدا توندوتیژی بەرامبەر بە ئافرەت نییە؟ ئایا ئەو پرسە هەستیارە چۆن چارەسەردەکرێ؟.

لە هەموو ئەو وردەکاریەی ئاماژەمان پێدا کارەساتتر ئەوەیە هەموو هەنگاوێکی حکومەت لەلایەن نەیارانی حکومەتی کوردستان بە هەل دەقۆزرێتەوەو دەبێتە کارتێکی مەترسیدار بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی بەتایبەت ئەو بێ بنەمایەی لە میدیای کوردی ڕا دەوەشێنرێو گچکەترین ڕووداو دەکرێتە سینارۆییەکی گەورەو دەبێتە نەنگیەك بۆ ئاسایشی کوردستان.

بۆیە دەبێت زۆر بە وردی بە میدیای کوردستان بچینەوەو بە وریایی ئەو هەواڵانە هەڵسەنگینین کە بۆ ناخۆی کوردستان پەخش دەکرێنو ئەو هەواڵانەی بۆ دنیا دەوەشێنرێن. هەروەها سیستەمی سیاسی زۆربەی

**وڵاتانی دنیادا چەمکی ئاسایش فرەڕەهەندیو فرەمانابییەکی گەورەی بە خۆیەوە دیوە، بۆیە زۆر پرس هەن دەبێت زۆر زۆر بە هەستیاری مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ.**

***دەقی پڕۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستانە**

*۲۰G COUNTRIES ،۲۰G women trust organ

**نیگار نادر: پاریزەر * هەڵگری ماستەر لە دیراساتی ئاسایشی نێودەوڵەتی**

# مەلەفی دادگایەكان

بەڕێزان: خەونێكی گەورەبوو بۆ هەموو تاكێكی كوردیو هەموو ئینسانێكی ئازادیخواز، كە ئەمڕۆ سەدام حوسێنو داروودەستەكەی لە بەرانبەر دادگا راگیراون بە تۆمەتی ئەنفالو كیمیابارانكردنی كورد.

چەند دانیشتنێك لەو دادگاییكردنە بەڕێوەچووە، گەشبینی دوێنێی شەقامی كوردی بە رەهەندی دادگاییكردنەكە روو لە كزییە، هەست دەگكرێ هۆلی دادگا بۆتە یەكلایكردنەوەی كێشە سیاسییەكان نەك وەرگرتنی مافی قوربانی لە جەلادن ئەمانەو كۆمەڵێ سەرنجی تر ئەمڕۆ بوونەتە باسوخواسێكی هەنووكەیی شەقامی كوردی، بۆیە ئێمەش وەك دەنگەكان بە پێویستمان زانی بەم چەند پرسیارەی لای خوارەوە لە دەرگای كۆمەڵێ لە رۆشنبیرانو نووسەرانمان بدەین.

دەستەی بەڕێوەبردنی دەنگەكان

- دادگای بالآی تاوانەكان لە ئێراق تا چەند پێوەرو گونجاوە بۆ دادگایی كردنی تاوانبارانو كۆكوژی كورد؟

نیگار نادر: بێگومان ئەو گەڕەلاوژە سیاسییەی لە ئێراقدا سەری هەڵداوە پەیوەندی راستەوخۆی هەیە بە سیستەمی دادگاییکردنەکەوەو تەواوی ئەو کۆدانەی پێی بەڕێوەدەچن.

بەر لە هەر پرسێك بوونی دادگای تاوانەکانو ئەنجامدانی یەکەمین دانیشتنی بە دادگایکردنی گەورەترین دیکتاتۆر لە بارودۆخی ئێستا ئێراقدا کارێکی ئاسایی نییەو جیاوازییەکی زۆری هەیە دەگەڵ ئەو دادگا بالاّیانەی تاوانباریان بە تۆمەتی تاوانباری جەنگ یان بنبڕکردنی رەگەزی لێ دادگایی کراوە، بۆنموونە دادگاییکردنی میلۆشڤیچ دانیشتنەکانو بەڕێوەبردنیان. بەر لەهەرە شتێ: ئەگەر بە وردی سەرنج لە هۆڵی دادگایەکە بدەین، راست دەبینین کە هۆڵەکە بە هۆڵێك دەچێ کە بە ریمۆدکۆنترۆڵێك بەڕێوەدەچێو سەرپەرشتی دەکرێو هەموو جولەو دەنگو دیکۆرەکانی ئاسایی نین.

وەك دەبینین دانانی کامیراکانو بڕینی هەندێك دیمەنو یا مۆنتاژکردنو نیشان نەدانی پارێزەرو داواکاری گشتی لە زۆر لەو کاتانەی کە گفتوگۆ دەکەن یا پرسیار دەکەن یا پچڕانی دەنگو هەڵەی زمانەوانی لەکاتی وەرگێڕانیدا کە تێکڕاییان پەیوەندیان بە یاسای داگایی کردن هەیەو بە پشتگوێ خستنیان دادگاییکردنەکە تێژی دەبێ لە کەموکوڕی یاسایی.

هەروەها ئەو جەدوەلەی لە یەکەم دانیشتن را کاری پێکراوەو پێشکەوتنی رووداوی دوجێل بە رووداوو کارەساتی ئەنفالو درێژەکێشانی

دانیشتنەکان بۆ ماوەی چەند مانگێك بەو ڕووداوەو نانەوەی زنجیرەیەك ئاژاوەو پێشهاتی سیاسی لەو دەمەیدا هەموو جێی لەسەر ڕاوەستانێن.

بە هەموو مانایان ئەنفالی قڕکردنو بنەبڕکردنی ڕەگەزی لەو دادگاییەدا هێندەی هەست بە گچکەکردنەوەو بە هەند وەرنەگرتنی دەکرێن هێندە کار بۆ چەسپاندنی وەکو تاوانێکی دژ بە مرۆڤایەتیو نەتەوەیەك ناکرێو، دادگایەکە بە ئەنقەست خەمساردی دەکا لە ئاست ئەو تاوانەداو بە شێوازگەلێکی سیاسی شڵەژاویەك لەناو هۆڵی دادگادا دەنێتەوە، ئەگەر نا بۆ سەدام ئەوە سێهەم دانیشتنە لە هۆڵەکە دەکرێتە دەرێ، ئەگەرچی جارانی پێشوو گەلێك زیادەڕشۆیی دەکردو ڕێی پێدەدرا زۆر قسەبکا، کە لە ڕووی یاساییەوە گرنگ نەبوون.

پاشان ئەنجامدانی دادگایی کردنەکە لەناو ئێراقدا لە جێی خۆی نییە، یا دەبوو لە لاهای بووایە یا لەسەر خاکی کوردستان، چونکە پێکهاتەی ئێستای ئێراق کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە بەسەر پرۆسەی دادگاییکردنەکەو ڕەهەندەکانی. ئێراق ئەوڕۆ بە قۆناغێکدا دەڕوا کە خودان سکراتۆرێکی سیاسی ناکامڵو نەچەسپووەو هەموو بڕیارە سیاسییو یاساییەکانیشی دەرنجامو دەرهاویشتەی ئەو ئەزموونەن. چونکە ئێراقێك هەشتا ساڵ بەڕێی کۆمەڵگایەکی پەستێنراوو چەپێنراوو تێژی لە حوکمڕانی

دیکتـــاتۆرو ململانێـــی ڕەگەزپەرســـتیو هاوڵاتیـــانی تـــژی پـــەروەردەبوو بـــە ئـــەخلاقیاتی دیکتـــاتۆری، هـــەتا ئـــەو یاســـادانەرانەی کـــە یاســـای ئێراقیـــان نووســـیووە زۆربـــەیان بەدەرنـــەبوون لـــەو ئەخلاقیاتـــەو تـــا ئێســـتاش زۆربـــەی هـــەرە زۆری هاوڵاتیـــانی هـــەمان تێڕوانینیـــان هەیـــە لەســـەر نەتـــەوەی کـــورد، لەبۆیـــە وەهـــا ســـانا نییـــە ڕێـــك پـــاش ســـێ ســـاڵان دیکتـــاتۆرێکی ســـی ســـاڵە بێنیـــە نـــاو ئـــەو کۆدامودەزگایـــەو پێی دادگایی بکەی.

٢- پرۆســـەی دادگاییکردنەکـــە چـــۆن دەگـــوزەرێو تـــا چـــەند لەگـــەڵ خواستی جەماوەری کوردستانو سکاڵای زیان لێکەوتووانە؟

نیگـــار: ئەگـــەر بـــە وردی ڕۆبچـــینە بنـــەوانی دادگاییکردنەکـــە دەبیـــنین هێندە مەتەڵ ئـــامێزەو مەرامگـــەلێکی لـــە پشـــتەوەن لـــەبۆ ئامانجێـــك ڕێکخـــراوە دەشـــێ بێـــژم زۆر دوورە لـــەوەی تراژیـــدیاو تـــاوانی ئـــەنفالی وەکو تاوانێکی پلە یەك بچەسپێنێ.

مـــن هێنـــدە لـــەوە نیگـــەرانم کـــە کـــەسوکاری ئـــەنفالکراوەکان تووشـــی گـــەورەترین دڵشـــکان بـــبنو تێکـــڕای هیـــواو خواســـتەکانیان ئەنفال بکرێن، چونکە من وادەبیـــنم بـــە تـــەنها قـــەرەبووی مـــاڵی بـــەس نییە بۆ ئەو قوربانییانە.

زیـــانی ئـــەنفال هێنـــدە گەورەیـــە کـــە بـــە قەرەبووگـــەلێك چـارەنابێو پەیوەســـتی بـــە ویـــژدانی نەتەوەیەکـــەوە هەیـــە. ئـــەو تـــەرەزە دادگایـــە

مەودایــــەکی بــــەرینی هەیــــە دەگـــەڵ خــــودان ســـــکالاّیەکانو کۆســــتکەوتوانی ئـــەنفالیّو ئـــەو چـــاوەڕوانییەی هـــەیانبوو لـــەبۆ دادگـــاییکردنی ســـەدامو بکـــەرانو یارمەتیـــدەرانی ئـــەو تاوانـــە، هـــەموویانی تووشـــی حەپەســـانو شـــۆك كـــردوە، هـــەروەها گـــوزەرانی پرۆســـەی دادگاییەکـــە بـــە شـــێوازێکی ســـستو خـــاو بەڕێوەدەچـــیّ کـــە گەلێك جێگای دلّساردییە.

ڕێکخســـــــتنی ســـــــکالاّیەکاو ئامـــــــادەکردنی شـــــــایەدحالاّن کەموکورتییەکی گـــەورەی پێـــوە دیـــارە، ئەگـــەر ئـــەو وردەکارییانـــە بـــە زووتـــرین کـــات چارەســـەر نـــەکریّ زەرەرێکـــی گـــەورەی لێدەکەوێتـــەوە، لەبەر ئەوەی ئەو دادگایـــە لـــەبۆ کـــورد هـــەلێکی گـــەورەبوو ئەگـــەر بـــە بەرنامەیەکی تۆکمە کـــاری بـــۆ کرابـــاو راوێـــژی کـــادیری پســـپۆری بـــۆ وەرگیرابا، وەکـــو نووســـەری بـــەریتانی جۆناپـــان رانـــدل لـــە دیمانەیـــەکی دەلّـــیّ: (کـــە ئـــەنفال چـــی لـــە هۆلۆکۆســـت کـــەمتر نییـــە، بـــەلاّم کوردەکان هێزی جولەکەکانیان نییەو بیّ هێزنو دەبیّ وریابن.

لە ڕوویەکی دیکـەوە ئەگـەر بـەراوردی دادگایەکـە بکـەین لەگـەڵ بـوونی ئـەو کۆمـەلّی تاوانـە گەورەیـە، جیاوازییـەکی گـەورە دەبیـنین لـە هـەموو ئالیەتەکانیـدا، دەبـوو شـایەدحالّەکان بـە شـێوەیەکی پسـپۆرانە هەلّبـژێردرابان، چـونکە مـرۆ هەیـە زۆر بـە تراژیـدی ژیاوە، لیّ نـاتوانیّ دوو رسـتە بێـژیّ کـە کاریگـەرو رەوان بـیّو راسـتی

پێوەدیاریی و جەسورانە وەلامیان بداتەوە، چونکە لە یاسادا پیتیش مانا دێنێتە گۆڕینێ، هەروەها پێویست بوو پارێزەرەکان لە تۆپ پارێزەرانی کورد بوونایەو بە پسپۆڕی و ئەزموون، دەبوایە دەسەلاتی سیاسی بە بڕیارو بۆچوونی تایبەت بۆ ئەو دادگایە راسپاردبان.

**٣- رەخنەو سەرنجەکانی شەقامی کوردی چۆن دەبینن؟ ئەتوانن چ بگۆڕن لە رەهەندی دادگاییەکە؟**

نیگار: بۆ من جێی سەرسوڕمانییە کە دەبێژن شەقامی کوردی، جا چ جێی رەخنەو سەرنجی لەسەر ئەو پرسانە، بەدەر لەو هەولو پەلەقاژە کزەی رەوەندی کورد لەرێی هەندەك رێکخراوو سایتەکانەوە دەیداو تاوتوێی دەکا.

بە رای من کورد ئێستا لە سەختترین قۆناغی ژیانیدایە، هەموو ژیانی بە تەمێك داپۆشراوەو تووشی دارمانێکی گەورە هاتووە. زۆر دوور نەڕۆین ئەو شەقامە کوردییەی دەیلێن ئێستا هەموو جاش و ئەنفالچییەکانی لە باوەشی خۆیدا پاراستووو چۆن ئەوانەی فایلیان لێ ئاشکرابوو پاراستنیو مۆلگەی دانو، هەر ئەو شەقامەیە کە بێ ویژدانی تا سەر ئێسقانی هاتووە، ئەو شەقامە دەیان ساڵە کەسوکاری ئەنفالکراوەکان لە تەنیشتنی لە برسان دەمردنو پەراوێزی ژیان دەکرێن، پێی ئاساییی بووەو

ویژدانی نـەجولاوە، لەبۆیـە دەڵـێم کـورد لـە قـوولاێی ویـژدانی خـۆی را کەمتەرخەمـــە. بەرامبـــەری ئـــەنفال تـــا ئێســـتا ئـــەو تاوانـــە گەورەیـــەوەکی خـــۆو ئـــەخلاقیاتو ویـــژدانی رەگـــی دانـــەکوتاوەو نایهەژێنیێ، دەنا دەبووایـە لـەو رۆژانـەی کـە دادگـایی لەسـەر ئـەنفال بەڕێوەدەچـــیێ، زوومـــی میـــدیای جیهـــانی لەســـەر کوردســـتان لا نەکەوتباو دیمەنگەلێکی سەرسوڕهێنیێ بۆ جیهان پەخش کردبا!.

هـــەر هێنـــدە دەڵـــێم کـــە وڕیو بـــیێ ئاگـــایی شـــەقامی کـــوردی هەڵەیـــەکی مێژووییـــە لـــەو دە مەیـــدا کـــە ســـەنتەرو ڕێکخـــراوو دامـــەزراو وەك گـــەلای داران دابـــاریوونو بەهـــەموو لایانـــدا پـــارە دەچـــننەوە بـــۆ هۆبـــاڵی ئـــەو کۆســـتکەوتوانەی پـــاش ئـــەنفالیان لـــە ملێییـــە. هـــەروەها ئـــەو دەستەوەســـتانیەی میـــدیای کـــورد زۆر خەمهێنـــەرە. چـــونکە دەبووایـــە میـــدیای کـــورد سیاســـەتی تایبـــەتی خۆی هەبایە بۆ پەخشی ئەو دادگاییکردنە.

٤- بۆچـی چـۆنیەتی بڕیـاردانی ئـەنفال وەك کـردەی جینۆسـاید بـۆ کورد گرنگە؟

نیگـار: کـردەی ئـەنفالو بڕیـاردانی وەك جینۆسـاید بـۆ کـورد نـەك هـەر گرنگـە بـەڵکو پێداویسـتییەکی مێـژوویی ئـەو قۆناغەشـە، دەبـیێ ئـەنفال وەك هۆلۆکۆسـت بێتـە پێناسـەکردن، لەبەرئـەوەی کێشـە لەوەدانییـە کـە سـەدامو دارو دەسـتەکەی بکـەری ئـەو تاوانـە

بوون، بەڵکو کێشەکە لەوەدایە کە سەدام نموونەیەکە لە ئەخلاقیاتی شۆڤێنی، جا ئەگەر ناوەگکان بگۆڕدرێن دەشێ ئێستا چەندین سەدامی دی هەبن هەمان تێڕوانینی قڕکردنیان بۆ نەتەوەی کورد لە هزردا هەبێ، هەر رۆژێك هەلیان بۆ بڕەخسێ دووبارەو چەند بارەی ئەنفال دەکەنەوە. بۆ نەتەوەی کورد چ ناگۆڕێ لەسەردەمی شای ئێراندا یا ئێستا، یا لەسەردەمی ئەتاتورکدا یا ئێستا.

لێرەوە کورد دەبێ هوشیارترو ژیرانەتر مامەلە لەگەڵ ئەنفال‌و بنبڕکردنی نەتەوەیی خۆی بکا، ژ بەر هەندێ بە رای من ئەنفال بۆ کورد لە پراکتیك و ئەجێندا دا هەیە لێ بە میکانیزمی دی‌و بە رووی شێوازی دی.

ئەگەر کورد زۆر زیرەکانە کارەساتی هەڵەبجەو کارەساتی ئەنفال بە جینۆساید نەچەسپێ، جارێکی دی ئەو هەلەی وەدەست ناکەوێتەوەو کارتێکی نێودەوڵەتیش لە دەستت دەدا بۆ ناساندن‌و پێناسکردنی نەتەوەیی.

هەولێر: ٢٦/٩/٢٠٠٦

# کۆڵەواری جێ زمانی ژن لە ئەدەبدا

جێـی زمـانی ژن لەهــەر بوارێکـدا جـوانیو لەهــەر سـەردەمێکداو لەناواخنی هەر بوارێکدا بەڕەوە نووســەر ڕوو لەهەریــەك لــە ژانرەکـانی ئەدەب دەکەنو هەریەکەیان بەشـێوازێك زمـانی لێـدەکووتیو دەکەوتـە تەقەلا بۆ کردنەوەی جێی زمانی خۆی لەو ژانرەدا، لـێ بەدەگمـەن نـەبێ نووسەرانێك هەڵناکەون کە جێی زمانی خـۆ بکەنـەوەو جێـی زمانیـان دیارو بەرچاوبێتو زمانیان هەڵکەوێ.

جێی زمان دیاربوون بەسەر هەر کایەکەوە مانای ئەوە دەگەیەنێ کـە رۆشنبیر توانایی تەواوو بـە برِشـتی بەسـەر ڤـێ زمانێـدا بشـکێو بـە خەستو خۆڵی پەلوپۆ بهاوێژێتە هەموو ئاقارەکانی زمانو بایی هەندێ سەردەربەرێ، کە نازناوی ئەدیبو رۆشنبیری لێ خەسار نەبن!

ئەدەبی کوردی یەکە لەو ئەدەبە گچـکەو قەتیسـماوانەی تـا ئێسـتێ پەلوپۆی خۆی نەهاویشتۆتە ولاتانی دراوسێو دەوروبەری خـۆی، لەبۆیـە زمانەکەشی زمانێکە لەخۆمان واوەتر کەس هەر هەوڵی خوێندنەوەشـی نـادا بـەو مانایـەی لـەنێو ئـەڤ ئەدەبـە قەتیسـماوەدا زمـان کەوتۆتـە گەمارۆوەو ئەڤ نووسـەرو رۆشـنبیرو هزرڤانانـەی جێـی زمانیـان دیـارە گەلەك دەگمەننو لەپەنجەکانی دەست تێپەڕ ناکەن.

ئەگەر ئاوڕێك لەزمانی ژن بدەینەوە لە چەندین ساڵی بەرێدا هەست بەخاویو کولیەی زمانی ژن دەکەین لەنێو هەموو ژانرەکانی ئەدەبداو لەو رێچکەزمانە نەبەزاندوە کە زمانی پیاوی پێدا ڕۆیوە لەو وشانەی پتر بەکارنەهێناون کە لەناو زمانی پیاواندا بەکارهاتوونو جارجارەش هەندەك وشەی مەیلەو ئیرۆتیك دەکاربردوەو بەکارهێناوە لەبۆئەوەی ژن بوونی خۆی وەدەرخاو لەلایەن پیاوانی نووسەریشەوە بە جەسارەت ناوبنرێ.

گەلەك بەدەگمەن نەبێ ژنی نووسەر نەیتوانیوە ژیان بەزمانی خۆی بگوازێتەوە ناو ئەدەبو ژیان لەئەدەبدا بڕەنگێنی، بەو مانایەی تەنها لە سوچێکرا لەو پەیوەندییانە دواوە کە بە خۆشەویستی ناودێرکراونو لەو ئازادیە باوانە دواوە کە لێی حەرام کراون بۆ نموونە: لەزۆربەی هەرە زۆری شیعری ژناندا یەك شێوە داڕشتنو یەك فۆرمو یەك شێوە ئیستاتیکای دەبینیەوە وەکو، ئەشق لەو زەمەنەدا، لەخەونە رەنگاوڕەنگەکەمدا، فریشتەیەکی ناسکم، پاکیزەیەکی ئەبەدی، نازدارێکی ساویلکە، قوربانییەکی دۆشداماو، خۆشەویستێکی دەستەوەستان و، ژنێکی هەڵخەلەتێنراو!!.

بە کوردی لەسەرێ را پێدابێی هەموو عەشقی هێناوەو بردوە عەشقی لە هەموو شتێك ئاڵاندوە لەوەدەمەیدا زۆر بە دەگمەن نەبێ لەو کۆمەڵگەیەدا کەسێکی عاشق نابینیەوە! عەشقیش خزێنراوەتە قاڵبی مۆدەی وەکو ڤالانتاینو چەندین بابەتی دیکەی سادەو بازاڕی، لەبۆیە ئەگەر سەرنجێك باوییێنە وێستگەو پێگەی دەنگی ژن لەئەدەبی کوردیدا

لەبۆمان روونتر دەبێ کە تا حاڵی حازریش ئەو ڕێچکەیە چۆن دەگوزەرێ‌و چۆن لەجێی خۆ هەڵدەکشێ‌و دادەکشێ‌و بۆ گۆڕانکاری ناخولقێنێ بۆ نابێتە جێی سەرنج‌و تێهزرینێ! جێی بێهودەییە ژنی نووسەر پێیان وایەو وا دەڕواننە ئەدەب‌و بەتەنها ئەو بابەتە لەقاڵبدراوەیە دوورە لەژیان‌و لە بەتەنێ ئەدەب مەیدانی پەیوەندییە دڵدارییەکانەو مافە باوەکانی سەردەمە لەودەمەیدا ژیانی ژن تژیە لە گەلێك ڕووداو، بەدیوێکی دیدا تائێستا ژن ژیانی بەهەموو ڕەنگاکانیەوە تێکەڵی ئەدەب نەکردوە دوورەپەرێزانە مامەڵە لەگەڵ دەورووبەر دەکاو پێی وایە بەتەنها نڤیسین‌و بڵاوکردنەوەی هەندەك شیعری تەونە جاڵجاڵۆکەیی تاکە ئەرکیەتی‌و ئەو تازە ڕۆشنبیرێکی کامڵە خافڵ لەوەی ژنێکی بەئاگا کە بەیانی لەخەوێ هەڵدەستێ هەموو ئەوانەی دەستیان لێدەداو لەدەورەی خڕبوونەتەوە بۆی دەبنە بەربەست‌و کێشە هەتا ئاوو سەوزەو کرێ خانوو وردەی ناو جزدانەکەی بەرزی پێڵاوەکەی جۆری قوماش‌و کراسەکەی گەورەترین کەرەستەن بۆ نووسین.

ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە کە ژن چۆن لە تەواوی کایەکانی ژیاندا لە پەراوێزدایە لە کایەی ئەدەبیش بە هەمان شێوە، بۆ نموونە لەو چەند ساڵەی دوایدا هەموو ئاگاداری دابەشبوونی نووسەرانین بۆ ناو تاقم‌و دەستەو کۆمەڵەی جودا جودا، بەلام لەناو ژنانی ئەدیبدا ئەو کۆبوونەوانەش دروست نەبوون بەو ماناییەی ئەو ژنە ئەدیب‌و نووسەرانەی ئەوڕۆ لە مەیدانن هێندە لێك پەرتەوازەن هەتا لەسەر

ئاستی کەسێتیشدا دۆستایەتی یەکتری ناکەن‌و هیچ هەماهەنگی تۆڕیکی پەیوەندی لە نێوانیادا نییە!

دەکرێ ئەدەبی کوردی بەو گۆمە لێڵە بچوێنین کە لەناو خۆیدا پەنگی خواردۆتەوەو قەتیس ماوە، چونکە لە کۆتایی سەدەی بیست‌و یەکەمدا نە وەرگێڕدراوەتە سەر هیچ زمانێکی گەورەو نە هیچ زمانێکی سەرنجکێشی وەرگێڕاوەتە ناو خۆی، ئەوجار زمان‌و ئەدەبی ژنیش لە دیوە هەرە ئازاربەخشەکەی ئەو گۆمەدا وەستاوەن!

ژنی ئەدیبی زۆر لە نەتەوەکان زۆر وردو هونەریانە خەبات‌و چەوساندنەوە بەرەنگاربوونەوەکانی رەگەزی خۆیان لە دەقی بەنرخی ئەدەبیدا نووسیوەتەوەو ژنە تێکۆشەرەکانی رەگەزی خۆیان نەمر کردون، بەڵام بەداخەوە کە ئەدەبی کوردی خاڵیە لە زمانی ژنێك کە مێژووو خەباتی هاوڕەگەزی خۆی لە دەقی شایستەدا داڕشتبێ بۆ نموونە، ژنانی پاشماوەی ئەنفال ژنانی پێشمەرگە لەشۆڕشەکاندا!

ژیانی ژن زۆر زۆر پڕ کەرەستەترە بۆ نووسین، ژن بابەتگەلێکی زۆر هەستیاری لەبەردەستن تا بە هونەریانە بە زمانێکی ئەدەبی دایانڕێژێ یەك لەوانە ژن دایکەو لەناو هەناوی خۆیدا مرۆڤێکی تر دروست دەکا، یا ژن بە جۆرەها شێواز توندوتیژی بەرامبەر دەکرێ، ژن بازرگانی پێوەدەکرێ، مرداربوونی زمانی ژن زۆر شێوازو زۆر ڕووی جیاوازی هەن وەك نەبوونی جێ زمانی ژن لە ڕەخنەی ئەدەبیدا، هەتا ئێستاش ڕەخنەی ئەدەبی زمانی ژنی پێوە دیار نییە هەموو ئەڤ ژنانەی لەو مەیدانەن چاوەڕێی ڕەخنەی پیاوانی نووسەر دەکەن لەسەر بەرهەمەکانیان یا بە

دیوێکی دیدا ژن نەبۆتە ڕەخنەنووسی تایبەتمەند بە دیدی ڕەخنەگرانە بڵاوکراوەو کتێبە نوێیەکان بەسەر بکاتەوەو خویندنەوەی تایبەتیان بۆ بکا!

دیوێکی دیکەی مردار بوونی زمان ئەوەیە، کە هیچ هەڵسەنگاندن و ڕانان بۆ کتێبێك ناکرێ بە زمانی ژن جار بە جار هەوڵی تاق و تەرا دێنە پێش چاوان، بەڵام مەبەستی من بە گشتییە وەك دیاردەیەکی بەرچاو بۆ نموونە، بوونی دە ژنی ڕەخنەگر یا هەڵسەنگێنەری کتێب کە ناوو بابەتەکانیان ببنە جێگای مشتومڕو تێڕامانێ بۆیە سەیرو نەشیاو نیە ئەگەر بڵێین ئەدەبی کوردی ئەدەبێکی پیاوانەیە خاڵییە لە زمانی ژن.

کۆڵەواری زمانی ژن لێردا وەدەردەکەوێ کە ژن نەتوانێ وێنەو ڕەنگ و دەنگی خۆی بگوازێتەوە ناو ئەدەب بە تەکنیکێکی ژنانەی تژی لە ئیستاتیکاو راستگۆیانە، کاتێك ئەدەبی ساختە دیتە بەرهەم کە زمان تیدا کۆڵەوارەو نووسەر راستگۆ نییەو بەتەنها سەرقاڵی لاساییکردنەوەی نووسەرانی دی دەکا، بۆیە ئەگەر ورد سەرنج بدەینە زۆربەی دەقەکانی نووسەرانی ژن ئەوڕۆ هەست بە وێکچونێکی بەرچاو دەکەین هەر لە زمان و لە فۆرم و لە ناوەرۆکدا وەکو پێشتر ئاماژەم پێدا هەموو تێکرا باسی عەشق دەکەن وەکو ئەوەی بەتەنها عەشق تاکە بابەتی ژیانی مرۆڤ بێت بەتایبەتیش ژن، بۆ نموونە بەدەگمەن نەبێ دەقێك نابینیەوە باس لە نەهامەتیە ئابوورییەکانی ژن بکا، یا تاریفی بێکاری بکا، یا باسی گرانی بازاڕ بکا، یا گلەیی لە سەرمایەداری بکاو ئافاتەکانی تەکنۆلۆژیا ڕەت بکاتەوە، ئەدی کامەیان باس لە نەخۆشی و

**ئاستەنگەکانی تەندروستی دەکا، ئەدی کوا رەنگەکانی پیریو کەنەفتی ژن !؟ تیکڕای ئەو نموونانە پێمان دەڵێن کە ئەو ئەدەبە خاڵییە لە زمانی ژن.**

# ڕەخنەی هونەرساز... ڕەخنەیەکە ناسوێ

٢٠٠٤/٨/٢٦

دروستبوونو رسکانی ڕەخنە لە هەر بوارێکدا فاکتەرێکە بۆ بەرەو پێشچوونو زیندوو مانەوەی ئەو بوارەو دروست بوونی ڕەخنەی بونیادنەر دەبێت تەواوی ڕەگەزەکانی ڕەخنەی تێدا هەبێ کە گرینگترییان ((عەقڵی ڕەخنەییو زمانی ڕەخنە.. کاتو جێگەی ڕەخنەو شێوەی دەربڕینی ڕەخنە)) تێکڕای ئەو ڕەگەزانە دەتوانن ڕەخنەیەکی بونیادنەرو دروست پێك بهێنن، بێگومان ئەمەش لە ئەنجامی مەعریفەو ڕۆشنبیریو جەسوورییەکی زۆرەو لە مرۆڤدا سەرهەڵدەداو لە نێو کەشێکی تەواو دیموکراسیدا ڕەگ دادەکوتێو گەشە دەکا....

دەگەڵ هەنگاو نانو بەرەو پێش چوونی هەر کۆمەڵگایەك دەرگا لەسەر زۆر پرسیار ئاوەلاً دەبنو زۆر وەڵامیش بزرو تەماوی دەبنو بە بەدواداچوونو زیرەکیەکی زۆری دەوێ کۆمەڵگەی کوردیو سیاسەتی کوردی لە هەنگاو نانێکدایە لەو هەنگاوانەو بۆیە پرسیارەکان زۆر چڕنو زۆر هەڵوێستو وەڵامیش پێویستە سەرکردەکان دەری ببڕنو ڕوونی بکەنەوە.. بۆ نمونە بۆ وەڵامو هەڵوێستەکانی ئەو قۆناغەی گەلەکەمان،

سەرۆك بارزانی لە پێش هەمووانداو بە ڕوونی هەڵوێستو وەڵامەكانی داونەتەوەو ڕوونی كردوونەتەوە.

كەسایەتی سەرۆك بارزانی یەكێكە لەو كەسایەتییە كامڵو تۆكمەو دەگمەنانەی كە لە كەسایەتی كەم سەرۆك حزبو سەركردەكانی دەورو بەرو دنیادا وەبەرچاو دەكەوێ لەسەر خۆییو هێمنی لە وتارو هەڵوێستەكانی دا لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەكانی پارتی دیموكراتی كوردستانو نەتەوەییدا ڕوویەكی دیاری ئەو كەسایەتییەیە..

لەو بارودۆخە سەختو ناسكەی ئێستاداو لە هەموو قۆناغەكانی ڕابردوودا هەمیشە كەمو لەسەر خۆ وتارو لێدوانو هەڵوێستەكانی دەردەبڕێ هیچ كاتێك دەگەڵ گۆڕانكاریە خێراییەكانی دەرو بەرو دونیا هەڵوێستو بڕیاری خۆی ڕاناگەیەنێ، بۆ نمونە وتارەكەی لەسەر فیدراڵیو ئایندەی گەلی كورد چ كاریگەریەكی هەبوو؟ چ لێزانانە ئامانجەكانی خۆی پێكا؟ چۆن تەواوی نەتەوەی كوردی دڵنیا كردەوە؟.. لە هەر قۆناغو سەردەمێكدا بووبێ لە دەربڕینەكانیدا هەمیشە هەست بەوە كراوەو دەكرێ كە ڕێك وەكو پێشمەرگەیەك زۆر بە جەسووری هەڵوێستی دەربڕیوەو هەردەم ئەو رووحە پێشمەرگانەیەی تێدا بەرجەستەیە پێشانی دووژمنانی گەلی كوردی داوە، بۆ نموونە كاتی قسەكردنی لەسەر كەركوكو دەستووری هەمیشەییو فیدراڵی جوگرافی.. هەروەها لە كاتی چاوپێكەوتن لەگەڵ میوانانو نێردراوی دەوڵەتان، لەگەڵ هێزە فرەڕەگەزەكانو سەفیرو جەنەڕاڵە سەربازییەكان. هەرچەند جارێ ئەو

دەركەوتبێ هێزێكی پێشمەرگانەی وەبەر جەماوەرو هێزی پێشمەرگەو هەتا میللەتی كوردیش داوەتەوە..

لە گفتوگۆیەكانیدا زۆر زیرەكانە وشەو دەستەواژە لە جێی خۆی دادەنێ‌و رستەش وەكو پێویست دەردەبڕێ‌و بەكورتی‌و بێ زیادەڕۆیی ئامانجی لە بەرامبەرەكەی دەگەیەنێ هەر ئەو سیفەتەشە بووەتە هۆی ئەوەی كە زۆر لە میوانان‌و نێردراوانی دەوڵەتان متمانەی تەواو بە قسەكانی بكەن‌و وەكو دەربڕینی بۆچوونی زۆرینەی كورد وەریگرن‌و نە هێندە بە میانڕەوی‌و نە هێندەش بە توند ڕەوی‌ئاماژە بە بۆچوونەكانی ناكات... لێرەدا دەمەوێ ئاماژە بە دوا وتاری بكەم لە یادی (٥٨) ساڵەی دامەزراندنی پارتی دیموكراتی كوردستاندا خوێندییەوە كە وتارێكی پڕ ناوەڕۆك بوو بۆ نووسەران‌و ڕۆشنبیران، هەروەها كادیرانی پارتی دیموكراتی كوردستان كە زۆر بە راشكاوانە داوای لێ كردن كە ڕەخنە لە سیاسەتەكانی پارتی بگرن لە هەموو بوارەكاندا. بۆیە هەر كەسێك بڕوای تەواوی بە خۆی نەبێت داوای ڕەخنەگرتن ناكا.. ئەو وتارە بابەتێكی نوێ‌و دڵخۆشكەرەو گۆڕانكاری لەخۆدەگرێ لە سەر ئاستی ناوەخۆو دەرەوە.

بەڵام لێرەدا پرسیار ئەوەیەو دەبێ ئەوە بێنینە پێش چاو كە ئایا ئەو تاكە وریاو جەسوورانە پێگەیشتوون كە بزانن چۆن‌و لەكوێ ڕەخنە دەگرن‌و ڕەخنەكانیان ئاڕاستەی كێ دەكەن؟ ئایا تاكی كورد جیاوازی لە نێوان ڕەخنەو داواكاریدا دەكاو لەگەڵ وەڵام بۆ هەموو پرسیارەكانی تێكەڵی ناكا؟

دەزانیَ چ ڕەخنەیەك هەڵبژێریَو چۆن ڕەخنەکەی دەربڕیَ کە ئەوە خەسڵەتی سەرەکی ڕەخنەیە هەروەها فکریشی هەبیَ بەرامبەر ئەو هەڵەیەی ئاماژەی پیَ دەکا..؟

بەداخەوە ئەو بۆچوونو ورد بوونەوە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا زۆر دەگمەنە، هەتا ئێستا زۆربەی زۆری سیاسیو ڕۆشنبیران وا لە نوسەر گەیشتوونو ڕاڤەی دەکەن کە ئەوەی بوو بە نوسەر دەبیَ ((هەموو ئەرکێك تێك بشکێنیَ)) ئەوەی بوو بەسیاسی دەبیَ ((هەموو پیرۆزییەك تێك بشکێنیَو بەناوی بکەویَ)) ئەوە تێگەیشتنی هەرە باوە بۆ سیاسەتو ڕۆشنبیری؟ دەبیَ ڕەخنەی ئەو دوو بوارە چی لیَ بەسەر هاتبیَ یاخود هەر لە دایك بووبیَ؟ ئەوە کلتورێکە ڕۆچوّتە نێو گرینگترین پێکهاتەی کۆمەلآیەتی کە لە ڕەگ هەڵکێشانی زۆر زەحمەتە..

لێرەدا ئەوەی دەمەویَ زیاتر تیشکی بخەمە سەر ڕەخنەی سیاسیە دەبیَ لە خۆمان بپرسین ئایا لە کوردستان ڕەخنەی سیاسی دروست بووە؟ ئەگەر هەیە لە چ ئاستێك دایەو کێن ئەوانەی ڕەخنەی سیاسی دەنوسن؟ ئەو ڕەخنەیە بە سروشتی خۆی دەگیریَ بە هەموو ڕەگەزو خەسڵەتو پێوەرەکانیەوە لە هەموو کەسایەتیو دەزگایەك ورد دەبێتەوە؟ یان ئەویش وەکو زۆر دروشمی تر سەرو گوێچکەی دەتاشریَو تەنیا بۆ ڕووکەش خەڵکی پیَ چەواشە دەکریَ؟ لە ناو ئێمەدا کلتورێك ڕەگی هەیە کە ڕەخنەو ڕێزمان لیَ تێکەڵ کراوە وا دەزانین ئەگەر یەکێك ڕەخنەی لە حزبێك یا سەرکردەیەك یا دەزگایەك گرت ئەوا بێڕێزی پیَ کردووەو لە ڕۆڵی کەم کردۆتەوە.

شتێك زۆر بە گرینگ دەزانم بۆ ئەو قۆناغەمان ئەویش دەبێ خۆمــان ڕابهێنین لەسەر جوداکردنەوەو دیتنەوەی ڕووی ڕاستەقینەی ڕەخنــەو لــە پێش هەموو کەسێکیشدا ڕەخنە لە خۆمان بگرین وەکو تاك... خێــزان... حزب.... نەتەوە، پێش ئەوەی دوژمنانمــان ڕەخنــەمان لێ بگــرن‌و بــەخاڵی لاواز لەسەرمان حساب بکەن. من هەمیشە پێم وایە ڕەخنە دەرمانێکــە دەتوانێ زوو زوو هەر میکرۆبێك لە جەستەی هەر مرۆڤێکدا بــێ بنــبڕی بکاو وشکی بکا بۆیە لەسەر دەسەلاتی سیاسی بەگشتی پێویســتە ئــەو بابەتە بە گرینگ وەربگرێ دەرگاکــانی خۆیــان بخەنــە ســەر پشــت‌و لــە هەمان کاتیشدا پێشوازی لەو شێوە ڕەخنەیەی هەیە بکەن وەکــو پێشــتر ئاماژەم پێکــردووە لەوانەیــە ئەوانــە تــەنیا وەلاّم بــن بــۆ ئــەو کۆمەڵــە پرسیارانەی جەماوەر هەیەتی یان نــەبوونی شــەفافیەت‌و پــەردە پۆشــی بڕیارو پێشهاتە سیاسییەکان بێت لە دڵی خەڵکــدا کۆبوبێتــەوەو داوای وەلاّمی بکا... دەبێت کار بۆ ئەوە بکرێ خەڵك فێری ڕەخنــەگرتن بکــرێ‌و دەسەلاّتی سیاسیش فێری وەلاّم دانەوەو پێشوازی کردن لــە ڕاو بۆچــوونی خەڵك بکرێ، ئەوە دەبێتــە پتــەوترین بناغــە بــۆ ئــەو دیموکراســییەت‌و ئازادییەی دەمانەوێ پێی بگەین، چونکە لە هەر کامێکیاندا بچــوکترین هەڵە بکــەین زەرەری قــووڵ دەکــەین، بــۆ نموونــە ســەرۆك بــارزانی لــە وتارەکەیدا دەڵێ (زۆر کــەس هــەن هــەوڵ دەدەن زەهــر بڕێــژن‌و بوختــان هەڵبەستن) ئەوە ئەو ئاماژەیە کە خەڵك فێری ڕەخنە گرتن نەبووە ئەوەیە کە لەو حاڵەتە بەرچاوانەی نێو کۆمەڵگەی کوردی((کە بوختــان کــردن بەناوی ڕەخنەوە) ئاڕاستەی هێزە سیاسیەکان‌و دەسەلاّتی سیاســی کــورد

دەکرێ کە حاڵەتێکی خەتەرناکەو ناوو ڕۆڵی ڕەخنە دەگۆڕنو دەشێوێنن بۆ نمونە زۆر ململانێی تاکە کەسیو هێرش کردنە سەر کەسی بەرامبەر دانە پاڵی تۆمەتی نابەجێ بۆ پلەو پایەی سیاسیو ئیداری هەموو ئەوانە وەکو ڕەخنە ناو دەهێنرێنو دەخرێنە ناو هەمان پێناسەوەو بۆ جۆرەها مەرام بەکار دەهێنرێن. هەروەها لە بەشێکی تری وتارەکەیدا دەڵێ (ئەوەی ئەورۆ بە پەرۆش بێ بۆ وەزعی کوردستان دەبێ قەڵەمی خۆی دەنگی خۆی، هەموو هەوڵو تەقەلای خۆی بخاتە گەڕ بۆ یەکێتی ڕیزەکانی گەلی کوردستان نەوەك بۆ فیتنە سازی) لێرەدا پەیامێکی گرینگ ئاڕاستەی نوسەرانی کورد دەکا کە بنوسنو بۆ یەکێتی ڕیزەکانی گەلی کورد ئەو ئاستەنگانەی سیاسەت دەربڕینیان سەختە بە قەڵەمەکانیان دەری ببڕنو هەڵوێستیان دیاری بکەن هەروەها دەڵێت (داوا دەکەم لەو دۆستو برادەرانە ڕەخنە بگرن، بەلاّم ڕەخنەی هونەر ساز) لێرەدا سەرۆك ئەرکێکی گەورە داوێتە سەر شانی نووسەرانو ڕۆشنبیرانی کورد بۆ ڕەخنەگرتن، بەلاّم ڕەخنە بە هەموو بنەمایەکانیەوە بە هەموو ڕەگەزەکانییەوە وەکو ئاماژەم پێ کرد بۆ نموونە ڕەخنە هەیە زۆر بونیادنەرە، بەلاّم ((کاتەکەی ئەوە نیە بگیرێ وەکو ئەو قۆناغەی ئێستا میللەتی کورد پێیدا تێدەپەڕێ یان وەختی نەهاتووە یا وەختی ئەوە تێپەڕیوە)). بۆیە سەرۆك بە هونەرساز ناوی ئەو ڕەخنەیە دەبات کە ڕەچاوی هەموو بارودۆخێکی تێدا بکرێ ڕۆشنبیران دەبێ بە ئەمانەتەوە کار بۆ رەخنەسازیو ڕەخنەگرتن بکەن پاش ئەوەی سەرۆك پێیان دەڵێ (خۆم پشتگیریان دەکەم) ئەرکەکانیان گەورەتر بووە دەبێ ڕێچکەی

خۆیان بگـۆڕن سیاسـەت چ پـەیامێکی هـەبوو ئـەوانیش نەیجوونـەوەو ئەزبەری نەکەن بۆچوونو هەڵوێستیان دیارو ڕاستەوخۆو کار بۆ رەخنەی بیناسـاز بکـەن. هـەروەها دەڵێـت: (کارێـك نەکـەن دوژمنـانی گـەلی کوردستانی پێ دڵخۆش کەن) دوژمنانی گەلی کورد زۆر لەوە دڵڕەشـترو ترسناکترن کـە ئێمـە دەیـانبینینو لێیـان دەبیسـتین، بـەڵام پەنـدێکی کوردیش هەیە دەڵێ: (دار کرمی لەخۆی نـەبێ ناقڵشـێ..) بۆیـە ئێمـە دەبێ بە وریاییەوە ئاگامان لەو کرمانە بێت نەهێڵین بکەونە گیانی ئـەو دارە جوانـەی خـوێنی هـەزارەها شـەهیدی بـۆ ڕژاوە.. چـونکە زۆر داری گەورەو پتـەو هەنـە کرمـی چـکۆڵەو پـیس دەیـانڕزێنیێ.. زۆر جـارانو ئێستاش دوژمنانی گەلی کورد کار بۆ پێگەیاندنو گەشـەپێکردنی ئـەو کرمانە دەکەن لە ناو گەلی کوردا هەیە، بۆیە دەبێ بنبڕ بکـرێن.. لێـرەدا ڕۆشنبیرانو نووسەرانو کادیرانی پارتی دیموکراتیش لەپاش ئـەو وتـارەی سەرۆك دەبێ ڕەخنە بگرن ڕەخنەی تەندروست، بەڵام بە ویژدانەوە هەروەك لە وتارەکەدا هاتووە، چونکە ویژدان ئەو دەسـکەوتە گەورەیەیـە هـەموو کـەس نایگـاتیێو نـاتوانێ کـاری پـێ بکـا.. یـەك لـە هـەرە دیـاردە ترسناکەکانی کۆمەڵگای کوردیو تاکی کوردی (کـەم بـوون یـان هـەر نەمانو لەناوچوونی ویژدانە) کە ئـەوەش پاشـخانی ئـەو کلتورەیـە کـە ڕژێمی بەعسی داڕوخاو کاری بۆ دەکـرد بـە سـەدان ژەهـری کوشـندەی تێکـەڵی ویـژدانو نـاخی خـەڵکانی عـیراقو میللـەتی کـورد دەکـرد و ناڕاستەوخۆ کاری بۆ ئیفلیج بوونی ناخی تاکی کورد دەکرد..

لەكۆتایدا دەڵێم هەر كاتێك ڕەخنەی هونەر ساز گیراو ڕەخنە كەوتە سەر ڕێچكەی ڕاستەقینەی خۆی ڕەخنەی كرچ و كاڵیش پێگەیشت لایەنی بەرامبەریش ئەركی گەورەی دەكەوێتە سەر شان كە چۆن سیاسەتی پێشوازی كردن لە ڕەخنەو بەدواداچوون لەسەر ڕەخنە پیادە بكا، چونكە تەنیا گوێگرتن لە ڕەخنەو قبوڵ كردنی ڕەخنە گرینگ نییە، ئەگەر لێكۆڵینەوەو دەستنیشانكردن و لێپرسینەوەشی بەدوادانەیەت!.. خەڵك جارێك دووجار دەجار دەست نیشانی هەڵەت بۆ دەكا، ڕەخنەت لێ دەگرێ ئەگەر هیچ لێپرسینەوە نەبێ بەرامبەریش وەڕەس دەبێ هەست دەكا ((ڕەخنەكەی دەسوێ)) كە دیاردەی (سوانی ڕەخنەو سوانی پرسیار) لە دیاردە بەرچاوەكانی نێو كۆمەڵگەی كوردیە، تاكەكانی كۆمەڵگە زۆر دڵ پڕن پرسیاریان زۆرەو هەست دەكەن ڕەخنەو پرسیارەكانیان دەسوێن و خۆدەجوونەوە.. بۆیە دەبێ سەركردایەتی سیاسی كورد بە ڕوویەكی نوێ و گونجاوەوە لەگەڵ گۆڕانی خێرایی هاوكێشەكان دەرگایەكانی والا بكاو پتر دەستی گفتوگۆ بۆ ڕۆشنبیران و كۆمەڵگە درێژ بكاو بە زمانی سەردەم بۆچونەكانیان لەگەڵ ئالوگۆڕ بكا كە پتەوترین بناغە دەبێ بۆ دروست بوونی ڕەخنەی بونیادگەرو هونەرسازو یەكێتی گەلی كورد ئومێد دەكەم ئەو وتارە قۆناغێكی نوێ بۆ ڕەخنەی سیاسی و ڕەخنەی تەندروست بخولقێنێ..

# قەندیل بەجیٚ ناهیٚلٚین
# یەك خویٚن و یەك سەنگەرین

لەناوەڕاستی دیسەمبەرەوە لەوەدەمەی تورکیا هیٚرشەکانی بۆ سەر کوردستان دەستپیٚکردو دڕاندانە گوندەکانی بناری قەندیلی بۆردومان کرد، ژانیٚکی قورس لە روحم گەڕاوەو لە ڕوحدا دەکولیٚم و رۆژ نییە هەست نەکەم ناخم بۆمباران دەکریٚ و بریندارکراوم، نامەویٚ بەهیچ شیٚوەیەك سەر بۆ بینینی هیچ هەلیکۆپتەریٚك هەلیٚنم و سەرنجی بدەمیٚ، لەودەمەیدا دلنیام بەهەمان هەلیکۆپتەر خاکی من بۆمباباران دەکریٚ، هەر بەبینین و دەنگی هەر هەلیکۆپتەریٚك قالبم تیٚکدەچیٚ و دلگراندەبم..

دووسیٚ جاری دیکە هەولمداوە لەسەر ئەو هیٚرشە بنووسم، لیٚ چونکە بیٚ ئومیٚدم لە بەهای نووسین و بەهای رۆشنبیری لە ژیانی رۆشنبیری کوردیدا، دەستم قەلەمی نەدەگرت و لیٚ هەموو دەمیٚ پەشۆکاوییەکی روحی بەرامبەر بیٚدەسەلاتی نەتەوەی خۆ وەکو چەقۆ دلم هەلدەکۆلیٚ..

لیٚ ئەورۆ ئەگەر ویٚنەی سەربڕینی ئەو گەریلایە نەمرەو ویٚنەی سەربازەکانی تورکم لەناوچەی شیٚلادزیٚ دیتن بەدل دەستم بەو نووسینە کرد...

بەبینینی ناوی قەندیل لەسەر پەڕەی هەر رۆژنامەو لـەناواخنی هـەر راپۆرتە هەواڵێکدا، هەستدەکەم تا ئێستا وشەیەك ماوە مانای شۆڕشـی نەتەوەیەکی بێکەسی لەخۆ هەڵگرتووە، لەچەند جیگایان کە پرسیار لە ناسنامەم دەکەن دەڵێم کوردم‌و خـەڵکی کوردسـتانم، یەکڕاسـت دەڵـێن بەپەرۆشین بۆ ئۆجەلان..

ئایا قەندیلت بینیوە؟ دەبێ چیایەکی زۆر سەخت بێت؟ مـن زۆر بـەو چیایە سەرسامم، ئایا بۆ ئێوەی کوردانیش وەهایە؟

هەموومان دڵنیاین‌و باش دەزانین دوو ساڵ دەبێ چیای قەنـدیل تاکـە ناوونیشـانە کـورد دەهێنێتـەوە بەرچـاوان‌و باسـان، جێـی نیگـەرانی دوژمنانیەتی.. هەروەها هەولێرێش تاکـە شـارە دوژمنـانی پـێ نابینـاو شێت دەبن.

ئەز گەلەك ورد دەنۆڕمە میدیای ئەورووپی‌و ئێرە، لەهەموو مانشێت‌و هەواڵەکانیاندا لەباشوری عێراق‌و شەڕکەرانی پەکەکە پتر هیچ وەسـف‌و ناوێکی بەکارناهێنن بۆ کوردستان‌و نەتـەوەی کـورد و دەزانـن چـۆن بـە دیبلۆماسی ڕاستییەکان ڕووپۆش دەکەن، جارجار نەبێ بەمەرام‌و ئامانجی بەرژەوەندی نەتەوەی خۆیان ئاماژەیەکی کاڵ دەکەن!

بەهەر حاڵ ئەو ڕووداوە جێی چاوەڕوانییە بۆ نەتەوەی کـورد، چـونکە چۆن بوون‌و هاتنە ئـارای دەوڵـەتێکی کـوردی خـەونێکی شـاعیرانەیە‌و دەبێتە بابەتی گاڵتەجاڕیە لـە سـەردەم لەسـەر زمـانی سـەرکردەیەکی کـوردو شۆڕشـێکی ئـەوها هەڵکەوتـەو شۆڕشـگێرانێکی ئـەوها پـڕ

بەرخۆدان بەتیرۆرست ناوزەد دەکرێن، بۆیە دەبێ نەتەوەی کورد چاوەڕوانی گورزی گەورەتریش بکا لێرەوە بەدوا.

پێمان ناخۆش بێ یا نا، لە زۆر سەرچاوە مێژووییە نوێیەکانیشدا کورد بە نەتەوەیەکی بێگانەپەرستو خۆ بەکەمزان ناسێنراوەو هەمیشەش بەپلانی هەر کەسو دەوڵەتێك بووبێ، دەسبەرداری خاکی خۆی بووەو خەنجەری لە پشتی برایەکانی خۆی داوە، هەتا ئەگەر لەبۆ بەرژەوەندی تاکە سەرکردەیەکیش بووبێ بەرژەوەندی نەتەوەیەك هەراج کراوە...

هەموومان باش باش لەوە دڵنیایین، کە ئەوەی ئەورۆ تورك دەیکا بەبەرچاوی هەموو دنیایە چ جۆرە کارەساتێکە، هەر کەس ناو هیچ دەوڵەتێکش نا لێ نەتەوەیەکگرتوەکان ئەگەر مابێ؟ باش دەزانێ پێخستنە ناو خاکی دەوڵەتێکی دی چ ێشێلکارییەکی نێودەوڵەتیەو! چ سزایەکەشی بۆ تەرخان کراوە!

ئەگەر گەلەك وردتر لەو ڕووداوانە چڕ بینەوە بۆمان وەدەردەکەوێ کە کەرکوكو مادەی١٤٠ هێرشکردنە سەر قەندیل چ پلانێکنو کێ داڕێژەرەکەیانە؟ چۆن بەدوای یەکتریدا ڕوودەدەن! بۆ کۆندلیزا رایس بەتایبەت دەگاتە کەرکوکێ تا مادەی ١٤٠دوابخرێ؟ لێ لەسەرئەو هێرشە دڕندانە خۆیان بێدەنگ کردوە؟

لەبۆیە زۆر دڵنیام ئەگەر نەتەوی کورد وەخۆنەکەوێو چەند ڕێگایەکی تر هەڵنەبژێردرێو ستراتیژییەك بۆ هەنگاوەکانی دیاری

نەکات، بە پلان بەرەی شۆڕشی نویٚ دانەڕێـژیٚ بـەرەو هەڵـدێر هـەنگاو دەنیٚ!

پێشمۆایە هێرشەکانی سەرچـیای قەنـدیلو دواخسـتنی مـادەی١٤٠ ئەنفالێکی نوێن بۆ قڕکردنی نەتەوەی کورد ، لـیٚ بـەمیکانیزمی نـویٚو بەدیبلۆماسیەتێکی نویٚو دەبیٚ ئەوانە لـە دیرۆکـی خـۆو لـە میـدیای خۆماندا بە ئەنفاکرنـەوەی قەنـدیلو ئەنفالکردنـەوەی کـەرکوك نـاوزەد بکەین.

لەبۆیە لەسـەر هـەموو کـوردان ئەرکـە سـەنگەری خـۆ بگوێزنـەوە کەرکوكو قەندیل لـەو قۆناغـەداو لەسـەر رۆشـنبیرو نووسـەرانی ئـەو نەتەوەیە ، ئەرکە سەنگەری خۆیان رابگەیەننو بەرەیـەك دابمـەزرێنن تـا چالاکیو خەباتی فەرهەنگی تێـدا بوەشـێنن، ئـەمن لەبـەرخـۆوە وەکـو نووسەرێك دەست درێژدەکەم بۆ هەر نووسەرو رۆشـنبیرێك کـە سـەنگەر دەگریٚ بەرامبەر داگیرکـەرانی کـوردو دەیـەویٚ هـەنگاوێك لـە بزاوتـی چەقبەستوی رۆشنبیریدا بهاوێژیٚو ببێژی قەندیل بـەجیٚ نـاهێلێن یـەك خوێنو یەك سەنگەرین...

# ناكشێمەوە

ئەوە چەند مانگێكە مانم لە نووسینو بڵاوكردنەوە گرتوەو لە هەوڵدانم بۆ ئەوەی دەسەڵاتم بەسەر خۆدا بشكێو یەكجاری بكشێمەوە، ئەڤ گاڤانەی لە نووسینو بڵاوكردنەوە بێزاردەبمو سەدو یەك شەڕ بەخۆم دەفرۆشم كە بۆ لە لەبری هەر شتەكی دی لە دنیایێ نووسینم هەڵبژاردو بۆ هەموو دەمێ لە سەر جێگایەكەم دووسێ كتێبو لەسەر مێزەكەم سێ چوارێكی دیو لەبن سەرم دەفتەرو قەڵەمێك، لەبن بالیفەكەم یەكی دی لەبن سیسەمەكەمو لەنێو جانتایەكەمدا دوسێیەكی دی، بەچوار دەوری سیسەمەكەم لەبەر كەڵەكە كتێبو رۆژنامەو گۆڤار زۆر زەحمەت بەیانیان پێهەڵدێنمو دەجوڵێمەوە، بۆ ژانی هەر نووسینێك دووسێ شەوان خەو لە چاوەكانم دەپەڕێنێو لەرزوتای دێڕە شێعرێك رەنگم لێدەبڕێ، سەودای وشەیەك چەند كیلۆمەتر بەدوی خۆدا رامدەكێشێو تاسەی كوردستان ئۆقرەم لەبەردەبڕێ، پەیڤی زۆربەی سیاسییەكان لەسەر سنووری كوردستانوو پۆخڵەواتو مانشێتی زۆربەی پاشكۆ ئەدەبیو گۆڤارەكان بە شاگەشكەبوونیان بە هاتنی نووسەرێكی عارەبو ناوزەدكردنی هەندێك نووسەری بەسەرچوو بە شاعیرو رۆشنبیری گەورەی گەلەكەمان بە چەند رۆژ تەبیاتم تێكدەداو نانیش ناخۆم!

ئەی خودایە چ ژنێکی تەوەلامو نووسینیش بۆتە دژوارترین قەدەرمو هەر ئەوبوو نەیهێشت لەو کوردستانە ئازیزەی جێم بێتەوەوو هەر ئەویشە لەو لەندەنە دلّرامەی تەنگەی پێهەلّچنیومو خەریکە لێرەشم هەلّدەقەنێ نازانم بۆ کوێی دی پەرتەوازەم دەکاو ناهێلّێ تەواو ئامێز لە خۆشەویستێك بدەمو بە پیاوێکی جوامێر بێژم تەواو من هی تۆمو بەجێت ناهێلّم..

ئەوە ئەمنم ئەو ژنە ئاوارەی بەبێ کتێبێکی نوێ هەست دەکەم، دنیا بەجێیهێشتومو هەر مالّێکم بێ کتێبخانەیەکی ئاوەدان پێ کوێرەمالّەو سەبوریم پێ نایە، تاماشاکە چ ژنێکی راگوێزراوەم لێ قەت ئامادەییم نییە ژیانی ناو ئەو کتێبانە راکەراك بە دوی ئەو وشانەدا بە هیچ شتێك بگۆڕمەوەو سازشی لەسەر بکەم، لەگەلّ نزیکترینو خۆشەویسترین کەس پێکبێم رێگەی بدەم ئەو تایبەتمەندیەی ژیانم درز تێخاو بشێوێنی.

ئەوە چەندەمین جارە خۆ لەنووسین دەتۆرێنم، ناخوازم ئیدی قەلّەم تاودەمیو لە سەنگەری بەرامبەر بەخۆمدا دەبێژم ئەگەر ئێستێ ژنێکی قاچاخچی یا ژنێکی رۆبۆت یا ژنێکی نایلۆن یا ژنێکی قورمیشکراو بایەی، لەوانەبوو خۆشحالّ بایو ژیانیشت رێك نەخشەکێشرابا، لەگەلّ ئەوەی هەموو ئەوان راستیان دەزانم چاوەڕێش دەکەم نووسین نەك هەر نەخشەکانی خۆمو ژیانی لەبەریەك هەلّتەکێنێو هەزارو یەك برینی دیکەم لە دلّو لەڕوح دەکاو لێشم نابێتەوە هەتا گیانیشم لێدەستێنێ، لەوانەیە بە گوللەیەکی گەرم یا بە کەوچکە ژەهرێکی تالّ یا بە مشتێك حەبی تفت لە دنیام بەرێتە دەرێ!

ئەز ئەو کیژە دەربەدەرەی ڕۆژ هەیە دووسێ جاران سەر بە درەختەکانی سەر ڕێگام دەکەم، تیژ تیژ دەگریەم بە هەنسك بە شەقامەکانی لەندەندا دەڕۆمە خوارێ بڕیار دەدەم هەر شتێك‌و هەر کەسێك دەمگرییێنی، ئیدی بیری لێنەکەمەوەو تەرکی کەم، بەتەنها ئەوەی ناتوانم ئەو بڕیارەی بەسەردا بدەم کوردستان‌و نووسینە.

هەر دەگەڵ ئەو هەموو داهێزانە روحیەم لەپڕ چاوێك بە نامەو ئیمێلی هەندێك لە خوێنەرانی خۆشەویستمدا دەخشێنم‌و تەزویەکی گەرم لە گیانم دەگەڕێ‌و بزە دێتەوە سەر لێوەکانم‌و دەڵێم ناکشێمەوە.

ناکشێمەوە ئەگەر لەناو ئەو هەراجخانەی ژیانی نووسەری کورددا هەر تەنها بتوانی سەرنجی بیست خوێنەر ڕابکێشی‌و بتوانی سنووری خۆو نێوان ئەو نووسەرە ڕۆبۆتانەی کاسبی بە نووسین دەکەن بپارێزی، گەلەك زۆرە هەر نەبێ بتوانی ژیانی خۆ هەموو بۆ نووسین تەرخان بکەی‌و ژیان وەکو شیعر لە باوەش بگری ئەوە بۆخۆی نیعمەتێکە.

ئەز ئەگەر دەستم داوەتە قەڵەم قەت بەو هیوایە نەبووە کە رۆژێك چاوەڕێی ئەوە بکەم بەسەربکرێمەوە بە رەخنە بێت یا بە مەدح‌و پێهەڵدان یا بە خەڵات‌و ناو پەیدان، چونکە دڵنیابووم لەڕوحی نووسەری کورد و تێڕوانینی، دڵنیاشم ئەگەر ئێستێ من نووسەرێکی عارەب یا ئەورووپی هەر رەگەزێکی تر بوومایە چ دەهۆڵێکم بۆ لێدەدراو چۆن دەبوومە بنێشتە خۆشکە، بۆیە ئەو بابەتە لەلای من تەواوبووە، بۆ من جێی تێفکرینێ نییە لەگەڵ ئەوەی هەندێك کەس بە نامەی بێ ناوەرۆك‌و پوچ، تەبیاتیان تێکداوم‌و جاری وابووە دووسێ رۆژان دایانهێزاندووم، سەد

**جار سەرزەنشتی خۆم کردوە، کە بۆ کێ دەنووسم بە تایبەتی ئەو نامانەی پاش بڵاوبونەوەی کتێبە نوێیەکەم (بۆ ئەوەی هەرچی هەتەو نیتە بە من بچێ).**

## زنار ڕووی ناوچەیەكی فەرامۆشكراوە

لەدەسپێكدا دەمەوێ بێژم زنار گۆڤارێكە دەبێ ناوەكەی خۆی زۆر بە وریایی بپارێزێ، بەو مانایەی زناری چیایان چەندە جوانو پاكو ئارامبەخشەو هەموو جیگایەكی لێڕا دیارەو لەهەموو جێگایەك ڕا دیارەو پتر پەل باوێتە ناو هەموو كایە رۆشنبیرییەكان.

پاشان زنار بۆ من بۆیە جێی دڵخۆشیو خۆشحاڵیە، چونكە لە ناوچەیەك لەدایك بووەو دێتە وەشان كە پشدەرو بیتوێنە، لەودەمەیدا پشدەرو بیتوێن بە درێژایی حەڤدەساڵی ئازادیو دەسەڵاتی كوردی بێ، لەڕووی سیاسیو كۆمەڵایەتی لەرووی رۆشنبیریشەوە بەقووڵی فەرامۆش كراوەو پشتگوێ خراوە، من هەمیشە كتێب فرۆشیە گچكەكەی قەڵادزیو كتێبفرۆشیە گچكەكەی ڕانیە لەناو زەینمدادەخولێنەوەو دەبنە جێی ئازارو خەمێكی قووڵ، ئەگەرچی چەندجارو بەچەند وتارو سەرنجان سەرنجی كوێخا رۆشنبیرییەكانی ئەوڕۆی كوردیم راكێشاوە بۆ بە تەنها گرنگی بە سێ پاریزگا گەورەكە دەدرێ لە رووی هەموو چالاكییەكی رۆشنبیریو چاپو بڵاوكردنەوە، لەهەمان كاتیشدا زۆر شارۆچكەی دیكەی وەكو كفریو كەلارو قەڵادزیو ڕانیەو دوكانو دەربەندیخانو شەقڵاوەو خەلیفان و...چەندینی تر، ساڵی كتێبێك یا گۆڤارێكیان

لەکاتی خۆیدا ناگاتیێ، لەوەدەمەیدا چەندین دەزگاو دامەزراو خەریکی ڕشانەوەی بەناو کتێبو گۆڤار وەشاندنیێنو خاوەنەکانیان بە دەرزەن کتێبو ژیاننامەی خۆو دۆستو برادەرانیان چاپ دەکەن لە مەخزەنەکانیاندا کەڵەکە دەکەن.

ئەوجار لێرەدا واپێویست دەکا ڕاو سەرنجی خۆم لەسەر ئەو کەڵەکە گۆڤارو رۆژنامانەی لە پانتایی رۆشنبیری کوردی رادەوەشێنرێن، دابەشیان دەکەم بەسەر دوو جۆراندا، یەکەم ئەوەی ناوی رۆژنامەو گۆڤارو هەفتەنامەو سایتە، زۆر بەدەگمەن نەبێ لەسەدا نەوەدو پێنجی بۆتە زبڵخانەو کۆنەخانە، دووەم گۆڤار رۆژنامە هەنە دەستیان بەکلاوی خۆیانەوە گرتووەو بەتەنها بۆ بیست کەسان دەردەچنو، گرنگ ئەوەیە پارەکەی دەستەبەربکەن، هەندێك بابەت خڕدەکەنەوەو دەجونەوە، یا خوویان داوەتە بڵاوکردنەوەی وێنەی ژنی ڕووت، یا نمایشکردنی ناوو وێنەی بەرپرسانو کاوێژی گەندەڵی دزی دەکەنەوە، لەبۆخۆی ڕاستییەکەی ئەوڕۆ ئەگەر لە گەندەڵیو دزیە بدوێی، لەسەرێ کۆمەڵگەرا تا خوارێ کۆمەڵگە زۆر بەدەگمەن نەبێ هەمووی هەوە، پشکێکی هەیە لە داڕوخانی ژیانی کورد، دزیو گەندەڵی خەریکە دەبتە کولتوور، بابەتێك نییە بە وتارۆکەیەك یا بە وێنەو زانیاریو دۆکیومێنتەك چارەی بکرێ، لە کاتێکدا کە بزاوی رۆشنبیریو رۆژنامەگەری نوقومی گەندەڵییە! هەموو گەندەڵێك ئەوڕۆ رەخنە لە گەندەڵی دەگرێو لەسەری دەنووسێ! لەبۆیە ئەوە تاکە خاڵێك لە

مەعریفەو پێشکەوتنی کۆمەڵگا ناگۆڕێو بەرەو پێش نابات، جگە لەوەی خەڵك فێری بەدبێژیو بەدهزرین دەکا!

زۆر نووسەر هەنە خوینیان دەبتە ئاو تا وتاریك دەنووسن بۆ گۆڤارێکی دەنێرن، پاشان کە دەبینن هێندە بەبێ زەوەری دادەبەزێ تا هەندەك جار دەیخەنە پشت چەند بابەتی پڕوپوچو تایبەتمەندییەکی پێنادەن، لەبۆیە نووسەر راست هەست دەکا بابەتەکەی سووك دەبێ یا دەمرێ، جا کاکە لەوە کوشندەتر نییە نووسەر هەست بەمردنی بابەتو کتێبی خۆی بکاتو هەست بکا بابەت لەبۆ گۆڤارێك دەنێرێ، لێ سەرنووسەرەکەی پێی ئەرکە بۆخۆی نامەیەك بنێرێ یا بەجوانی وەڵامی نووسەرەکە بداتەوە، رێز بۆ ڕاوبۆچونی دابنێ سەبارەت بە بڵاوکردنەوەی بابەتەکەی، یا ئەوڕۆ بابەتێك بڵاودەکەیتەو پاش دوسێ ڕۆژان دەبینی بۆچوونو تێڕوانینەکانت لە بابەتێکی نووسەرێکی تردا دەبینیەوە، بەبێ ئەوەی هەر ئاماژە بە وتاری تۆش بکا! هەموومان دەزانین ئەوڕۆ ئەخلاقیاتی نووسەریو بڵاوکردنەوە چۆن کارەساتێکە، من بەشبەحاڵی خۆ زۆر جاران شەرمێ دەکەم لەوەی بڵێم من دەنووسم یا بڵاودەکەمەوە!

لەوانەیە بۆچونو سەرنجەکانی من زۆر کەسان پەستو تووڕە بکا، لێ ئەوە راستییەکە دەبێ هەموومان بیزانین، هەمیشە برینی گەورە ژانی زۆرو قووڵە، ئێمەش نەتەوەیەکین خودان برینێکی گەلێك قووڵین، بۆیە دەبێ ژانەکەشی بچێژین. پاراستنی گۆڤار یا رۆژنامە لەو بارودۆخە هەڕاجکراوەی رۆشنبیریدا، کاریکی زۆر ژیرانەی پێدەوێ، ئەگەر ئەوە نەکرێ لاپەڕە پڕکردنەوەو رازاندنەوەی بە وێنان هیچ بایەخی نییە.

**لـه دوماهیـەدا سـەرنجم داوێمـەوە سـەر زنـارو دەڵـێم: بـێ لـەوەی هانگاوێکی باشی هاویشتوە لە بەسەرکردنەوەی نووسـەران‌و دوانـدنیان، دەبێ زۆریش ئاگاداری دڵی نووسـەران بێـت‌و بەرهـەمی نووسـەران بـە تایبەتمەندییەوە بڵاوبکاتەوە، هەروەها زۆرم پێخۆشە بـەو تـیراژە زۆرە تـا ئێستا بەردەوامە، دەبێ لەهەوڵی باشتر دابـێ بـۆ بـەردەوامبوونی خـۆی ببێتە گۆڤارێك خوێنەر زۆر بە پەرۆش چاوەڕێی دەرچونێی بکا.**

## بەنیشتمانبوون لە مەترسیدایە

نیشتمانێك هەن بەناوی پیاوەكانیانەوە دەناسرێن‌و ناودەردەكەن، پیاوگەلێكیش هەنە بەناوی نیشتمانەكانیانەوە لەبیر ناچنەوە.

بەو مانایەی نیشتمان گەلێك هەن بەناوی رۆشنبیرەكانیانەوە دەناسرێن‌و دەخوێنرێنەوە، رۆشنبیرگەلێكیش هەن بەناوی نیشتمانەنەكانیان نەمر دەبن‌و دەچنە ناو زمانانەوە.

زۆر جاران وارێدەكەوێ لەرێی كتێبێك یا وتارێك یا شیعرێك یا فیلمێك یا گۆرانییەك یا هەڵوێستی رۆشنبیرێكەوە نیشتمانێك دەناسی‌و خۆشتدەوێ‌و دەكەویە هەوڵی وەدەستهێنانی زانیاری لەسەری‌و لەخۆڕا وا هەست دەكەی نیشتمانێك بۆتە هاورێت‌و لەخۆشەویستی رۆشنبیرەكەشی ڕا ئەو نیشتمانەت هەرگیز لەبیر ناچێتەوە..

بەپێچەوانەشەوە هەندەك گاڤان نیشتمانێك لە زمان‌و زەینت هەڵدەنگوێ‌و دەناسی هێندە بە مێژوو شارستانییەتی سەرسام دەبی، كەیفت دەچێ هەموو زانیارییەكی لەسەر وەدەست بێنی‌و رۆشنبیرەكانی بناسی‌و بەرهەمەكانیان بخوێنیتەوەو لەبۆیە دەكرێ بێژین هەندەك رۆشنبیر دەبنە پەنجەرەو لەسەر ڕووی نیشتمانەكانیان ئاوەڵا دەبن‌و نیشتمانەكانیان دێننە بەرچاوان‌و سەر زمانان، بەدیوێكی دیكەشدا

هەندەك نیشتمان دەبنە پەنجەرەو دەخرێنە سەرپشت رۆشنبیرەکانیان لێـرا وەدەردەکەون.

هەمیشە رۆشنبیرە تۆکمەو گـەورەکان نیشـتمانی خۆیـان لەقەڵـەمو زمانو دەنگیاندا دەپارێزنو هەر وەجوڵێن جوانیو کولتورو ڕەسـەنایەتی پێشان دەدەنو لەگەڵ نیشتمانەکەیان یەك پێناسەیان بۆدەکرێ.

رۆشنبیرگەلێك هەن ئێستا بە قۆناخی بەنیشتمانبووندا تێنەپەڕیونو چەقیونو نازانن لە نیشتمانی خۆیانـدا چ دەگـوزەرێ، بـە هەرەمەکیانـە شانیان داوەتە بەر بەجیهانی بوونو لەسەر بەجیهانی بوون دەنووسن.

ئەڤ نووسەرو رۆشنبیرانە تەواوی تەمەنی خۆ دەگوزەرێنن، بەر لـەوەی لەتەواوی کولتـوری خۆیـان شـارەزابن، شـانازی بەوەدەکـەن کـە چـەند زمانێکی بیانی دەزانن، لەکاتێکدا شارەزایی تەواوی لـە دیالیکتـەکانی زمانی خۆیـدا نییـە! لەسـەر پێکهاتـەو نەخشـەی وڵاتێکـی ئـەوروپی دەنووسێ شارەزایی لەنەخشەی نیشتمانی خۆی نییـە! نـاوی شـارێك یـا کافتریایەکی ئەوروپا دەخاتە ناو وتار یا شـیعرێکیەوە کاتێـك ئاشـنایی تەواوی دەگەڵ دە گوندو چیاو نیشتمانی خۆی نییە.

# پەیامێکی نیشتمانی
# بۆ ڕاچڵەکاندنی میدیاو ڕاگەیاندنی کوردی

چەمکی نیشتمان پەروەری کاتێك ڕەگی پتەو دادەکوتێ‌و گەشە دەکا... کە تاکەکانی نێو کۆمەڵگە هەست بە جۆرێك یا ڕادەیەك یەکسانی بکەن لە مافی بەهاوڵاتی بوونیانداو سیمای خۆداسەپاندن بە تەواوەتی بسڕدرێتەوەو بەرژەوەندییە تاکە کەسییەکانیش نەخرێنە پێش بەرژەوەندییەکانی هەمووان‌و ڕاگەیاندنیش لەو قالبە دەربچێت کە بە تەنها خزمەتی حیزبێك یا گروپێکی دیاریکراو بکا یا ڕاگەیاندنەکەش ڕاگەیاندنی حیزبێك یان ڕێکخراوێك یان گروپێك بێت.

نیشتمانپەروەری قۆناغ لە دوای قۆناغ لە گۆڕاندایە نیشتمانپەروەری لەسەردەمی شۆڕشدا گەلێك جیاواز بوو لە نیشتمانپەروەری لە دوای ڕاپەڕین‌و ئازادی تا بە ئەمڕۆی جیهانگیری ڕادەگات، هەروەها ئەرکەکانی نیشتمانپەروەری لەسەردەمی بندەستی‌و خەباتی نهێنی‌و وروژاندن‌و شۆڕش... جیاوازبوو لە جۆرو شێوەی ئەرك لە ئەستۆگرتن‌و ڕاپەڕاندنی ئەرکەکان با لەناوەڕۆکیشدا ئەرکەکانی نیشتمانپەروەری هەریەك بن، کە قوربانیدان‌و خەبات کردن‌و پیرۆز ڕاگرتنی نیشتمان‌و

گەلو مێژووەکەیەتی لە پێناو ئازادیو سەرفرازیو دوارۆژێکی گەشو ئاسودە.

نیشتمانپەروەر بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە دەگەڵ گۆڕانی هەر قۆناغێك گۆڕانی گەورەی لێدەکەوێتەوە کە ئەنجامی هەر یەك لەو ڕەهەندانە کاریگەری خۆی دەبێتو بەجێ دەهێڵێت. بەڵام ڕاگەیاندنو میدیا یەکێکە لە گەورەترین دەریچە لەو دەریچانەی دەبنە هۆی بەهێزبوونی نیشتمانپەروەری یان لاواز بوونی نیشتمانپەروەری.

بۆ نموونە ڕۆژانێك خەڵك ئەنفال کردنی لە خۆ دەگرت، بەڵام ئامادەنەبوو بۆ ڕۆژێك لە نیشتمان دابڕێ، خەڵکانێك هەبوون بە زۆر لە زێدی خۆیان ڕادەگوێزرانو دور دەخرانەوە، بەڵام ئێستا لە دوای ئەو هەموو ماندووبوونو خەباتە پڕ زەحمەتانە خەڵکانێك هەن کە زۆر بە هۆشیارییەوە ڕێگای کۆچ دەگرنە بەرو مردن لە خۆ ئەگرن. وێرای هەر هەنجەتو بیانوێکیش هەبی خۆیان لە نیشتمان دادەبڕن. هەروەها ڕۆژانێك هەبوون خەڵك لە نێو هەزار جۆرە مەرگەسات لە خەبات خۆڕاگریو قوربانیدان بوونو لە نێو چەند کونو کەلەبەردا رادیۆیان حەشار دەداو لە نێو چەند بەهێز گوێیان بۆ دەنگی کوردستانو ئێزگەکانی تر ڕادەگرت.

کاسێتیان لەسەر هەڵدەگرت.... دەگەڵ ناوهاتنی هەر سەرکردەیەكو هەر پێشمەرگەیەك هەستیان بە سەربەرزیو سەرکەوتن دەکردو چەندەها شەو خەویان لێ نەدەکەوت.. بەڵام ئێستا زۆربەی خەڵك بەرە بەرە گوێ لە ڕادیۆو تەلەفزیۆنەکانی خۆمان ڕاناگرن، یا هەندێ جاران ئەگەر

بەرنامەیەك تایبەت بێت بە خەباتی سەركردەیەك یان گێڕانەوەی بەسەرهاتی شەهیدبوونی پێشمەرگەیەك یان یادكردنەوەی شەڕێك‌و سەركەوتنێك، ئەوا ئەگەر تەماشاكەریان ئەگەر هەشبێت زۆر كەم دەبێ.... هەر لە دوای خەباتی چەكداری‌و ڕاپەڕین دواتر لە قۆناغی هەڵبژاردن‌و دامەزراندنی حكومەت ئازادیەكی فرە ڕەهەند بەسەر هەموو كایەكانی ژیان‌و كۆمەڵگەدا هات، ئازادییەك كە هەر كەسە دەیخستە دروشمێكەوەو هەر كەسە بەجۆرێك لە خۆی دەوەشاندەوە، ئەوە ئاڵۆزیەكی دروست كرد كە تاكی كورد هەر كردەوەیەكی بكردبا دەیخستە بازنەی ئازادی‌و دیموكراتییەوە لەگەڵ ئەوەی چێژتنی تامی خۆشی‌و سەرفرازی لە سایەی سیستەمی نوێی جیهان كە ئێرەشی گرتەوە، هەندێك كاردانەوەی بەسوودی لێ كەوتەوەو دواتر بووە هۆی ئەو بەربلاَوی‌و فرە كەناڵییەی لە نێو ڕاگەیاندن‌و چاپەمەنی لە كوردستاندا سەری هەڵدا....كە هەر یەكێك كەوتە نێو بازنەیەكی گەورەی ڕاگەیاندن كە سەرچاوەیەكی بزری هەبوو هەر گروپ‌و حیزبێك بۆ بەرژەوەندی خۆی هەواڵ‌و دیداری دروست دەكرد.

لە دوای دامەزراندنی حكومەت‌و بەرە بەرە ئاوەدانكردنەوەی وڵات زۆربەی حیزب‌و ڕێكخراو دامەزراوەكان لە كوردستان كاریان لەسەر ئەوە دەكرد كە تاك ئینتیمای هەبێ بۆ حیزب پەروەری، ئەوەش پتر لە ڕێگەی ڕاگەیاندنەكانەوە سەری هەڵداو زۆربەی سەركردەو كاربەدەست‌و لێپرسراوە ئیداری‌و حیزبییەكان كاریان بۆ دروستكردنی بازنەیەكی بچوكترو تەسكتر دەكرد ئەویش خودپەروەری خۆیان بوو، لە بۆ ئەوەی

هەمیشە لە هەموو کەناڵەکانەوە دیمانەی لەگەڵ ساز بکریٚو وێنەی دەربچێتو مانشێتی هەر ڕۆژنامەیەك بە وێنەیەکی گەورەی ئەوەوەو ناوی ئەوەوە دەربچێت، کە لە ئەنجامدا ئەوانە بوونە هۆی دروستکردنی هەستی نا نیشتمانی لە لای زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵگەی کوردی.... دواتر لە لای بنەماڵەی شەهیدو ئەنفالکراوەکان... یان خەباتکەرو کۆنە پێشمەرگەو نیشتمانپەروەرەکان هەست بە ونبونی خۆیان بکەن لە نێو کۆمەڵگاداو بەرهەمی ڕەنجیان نەبیننەوەو ئەگەر یارمەتییەکیش بدرێن زۆربەی لەسەر دەستی ئەو کاربەدەستەو یان بەهۆی ئەو سەرکردەیەوە ناوزە دەکرێنو جا چ پڕۆژەیەك بێت...

زۆربەی حیزبەکان گەورەترین هەوڵیانداوە بۆ ئەوەی هەموو کامێرەکانی ڕاگەیاندن بەرەو خۆیان ڕابکێشن ئایا کێ وڵات دەپارێزێ.... گوند ئاوەدانکردنەوە دەکرێ پڕۆژەکان لە ژێر چاودێری کێوە بە پارەی کێ بەڕێوە دەچنو لە لایەن چ مەکتەبێکەوە چاودێری دەکرێن...

بەڵام لە قۆناغی ئێستادا کە حکومەت بەرەو جێگیربوون دەچێتو وردە وردە سەرەتایەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لە نێو کۆمەڵگەی ئێمەشدا سەرهەڵدەدەن، ئەو دیاردەیە بە مۆدیلێکی تر بە ڕووی جودا جودا دەبینرێت..

دەگەڵ تێکەڵ بوونی هەموو چەمكو دەستەواژەکانو بە کرچوکاڵ وەرگرتنو پێناسەکردنی ئازادیو دیموکراتیەت تاکی کوردی دەچێتە قۆناغی نا نیشتمانیەوەو بەرە بەرە خۆی ون دەکا، خۆ ونکردنەکەش ئەنجامەکانی دەنێو ڕاگەیاندندا پتر وەدەردەکەون کە سەرنج بدەین

هەندێك لێپرسراوو سەرکردەو دەسەڵاتدار هەنە کـە گەیشـتوونەتە ئـەو ئاستە لە خۆ ون کردن ئەگەر هەر لە ڕۆژێکدا هەر سـەرۆکی دائیرەیـەك یان وەزیرێك یان لێپرساوێکی حیزبی ...هتد... یەك ڕۆژنامە بەتەنها بـۆ سەردانەکانی خۆی... میوانەکانی خۆی لە بۆ کردنەوەی پڕۆژەکان لە ژێر چاودێری خۆی هێشتا هەر تێنوێتی ئەو ناشکێنێ‌و پتر هـەوڵ دەدا هـەر کارێك دەیکا هەموو دەوروبەرو هاولاَتیان بزانن ئەو بەو کارە هەڵستاوەو ئەو لە پشت ئەو دامو دەزگایەوە وەستاوە.

بەلاَم ئایا نیشتمانپەروەری پەیوەندیەکی قوڵی نییە دەگەڵ جیهانبینی هەر تاکێك‌و لە لای هەمووان لەو لاوازبوونە دایە؟

یان لە هزرو ویژدانی هەر مرۆڤێکدا تایبەتمەندییەکی هەیە کـە بـە پێی شوێن‌و کاری ئاستی مەعریفی‌و ڕۆشەنبیری دەگۆڕێت...

بێگومان کەسانێك هەن کە لەهەر پلـەو پایەیـەك دابـن‌و لـە هـەر قۆناغێکدا بن هێشتا هەموو پێوانەکانیان لـە یـەك ئاسـتدا ڕاگرتـووە بەردەوام لە خەباتێکی بێ وچان‌و دڵسۆزانەدان بـۆ ڕاچـڵەکاندنی نـەوەی نوێ‌و بەهێزکردنی هەستی نیشتمانپەروەری لەنێو هەر چـین‌و توێـژێکی ئەو کۆمەڵگایەدا بـۆ نموونـە لـە بروسـکەنامەی ((سـەرۆك مەسـعود بارزانی))دا بۆ مەکتەبی ناوەندی ڕاگەیاندن‌و هەردوو ڕۆژنامەی خەبات‌و برایەتی لە ژمارە (٣٧١٩)ی ڕۆژنامەی برایـەتی دا لـە ٢٣/٦/٢٠٠٢ لەو بروسـکەنامەیەدا بـە سـێ تـەوەر دەزگاکـانی ڕاگەیانـدن ئاگـادار دەکاتەوە لەو دیاردانـەی کـە پێشـتر ئاماژەمـان پـێ کـردن.... کەواتـە دەزگاکانی ڕاگەیاندن ڕۆڵێکی کاریگەریان هەبووە ئەگەر ناڕاسـتەوخۆش

بووبێ لە دروستکردنو ورووژاندنی هەستی نانیشتمانی لەلای تاکی کوردو کۆمەڵ... کاتێك خەڵك دەبینێ هەموو ڕۆژنامەیەك تەنها وێنەی کاربەدەستو سەرکردەیەکە، تەلەفزیۆنەکان تەنها گرینگی دەدەنە ئەو هەواڵانە؟ ئەدی خەڵکێك هەموو ژیانی کردۆتە قوربانیو تێداچووە لە سەر پێشمەرگایەتی، هەموو کەسوکاری ئەنفالەکان خاوەنی چەندان شەهیدن بۆ هەست نەکا ئەگەر یارمەتی دەدرێ، ئەوە مافی خۆیەتیو بەرهەمی ڕەنجی خۆیەتی بۆ هەواڵێك دروست بکرێ کە لە ڕێگەی فلان مەکتەبەو فلان سەرکردەوە ئەو یارمەتییەی دەدرێو ئەو پرۆژەیەی بۆ ئەنجام دەدرێ؟

کاتێك مرۆڤ دەگاتە ئەو پلەیە لە خاکی بوونو سادەیی دەبێ نیشتمانپەروەری لە لای گەیشتبێتە چ ئاستێکی بەرز کە قبوڵ ناکات وێنەی ئەو هەموو وەختێك لە هەموو ڕۆژنامەیەکدا دەربچێتو، ڕەتی ئەوە دەکاتەوە کە ناوی ئەو لەنێو هەموو ڕووداوو پرۆژەیەك نەنوسرێت مرۆڤ کاتێك ئەو هەڵوێستانەی تێدا دەردەکەوێت کە هەموو بەرژەوەندییەکانی خۆی لەپاش بگرێ تەنها مەبەستی بەرژەوەندی نەتەوەکەی بێت. بە جیهانبینییەکی ساغلەم لە ئەنجامی هەموو پێشکەوتنە کۆمەڵایەتیو سیاسییەکان بڕوانێ.

هەروەها لە تەوەرێکی تری بروسکەنامەکەدا هاتووە (کە چەندجار ئێوەم ئاگادار کردوە کە لاسایی خەڵکی تر نەکەنەوە)

لێرەدا بەدیار دەکەوێت کە میدیاو ڕاگەیاندنی کوردیو ڕۆژنامەکان بەداخەوە هەندێ جار وا هەست پێ دەکرێ هێشتا لە ژێر کاریگەری

ڕاگەیاندنی شێوەئامێزی حکومەتەکانی جیهانی سێیەمیان پێوە دیارەو یان کاریگەری مۆرکی ڕۆژنامەکانی ڕژێمیان پێوەیەو خۆیان لە بیردەچێتەوە ئەرکە پیرۆزەکانیان لێ ون دەبێ، کە زۆربەیان لە ژێر دروشمی دیموکراسیەت‌و لە ژێر دروشمی دەربڕینی ڕای ئازاد...

ئێمە دەبێ لەو قۆناغە ناسکەی پێدا تێپەڕ دەبین زۆر بە وریایی ئاگاداری هەموو گۆڕانێك‌و پێشکەوتنێك بین جا چ کۆمەلآیەتی بێت یان سیاسی ... هتد.

دەبێت هەموو گۆڕانێك لە بنچینە ڕا دەست پێ بکەین نەوەکو تەنها ڕەنگی پێشکەوتن‌و مۆدێرن لە خۆمان هەڵبسوین‌و بنچینەکەشمان هەر ژەنگاوی بێت دەبێت ڕۆژنامە لەزمان‌و فکردا بەرەو پێش بەرین نەوەکو تەنها بایەخ بە ڕووکارو وێنەو شێوەی پڕوپاگەندەی سادە بدەین.... چونکە لە تەوەرێکی تری بروسکەنامەکەدا هاتووە کە (ناوی من نەخەنە ناو هەموو بابەت‌و ڕووداوێك).

ئەگەر بڕوانینە مێژووی خەباتی ئازادیخوازی هەموو گەل‌و نەتەوەیەك پڕن لە ڕەمزو هێماو ناوو ناوبانگی سەرکردەیەك‌و هەموو نەتەوەیەکیش شانازی بە ناوی سەرکردەی خۆی دەکات‌و بە سمبولی دەزانێت.... ئێمەش وەکو نەتەوەیەك هەردەم ئەوە جێگای شانازی پێوەکردنە. هەروەها لە ولآتانی دەوروبەردا ئەو دیاردەیە زۆر بە زەقی دیارە، بەلآم لەو هەڵوێستە نیشتمانی‌و دیموکراتیەدا ڕوون دەبێتەوە کە ئێمە ئەگەر وردبین زۆر وەپێش ئەو ولآتانەی دەوروبەر کەوتووین لە دیموکراتیەتدا. بەلآم کاتێك ڕۆژنامە لە بازنەی تەقلیدی سوڕایەوە تەنها دەیەوێت لەو ڕێگەیەوە

هاولاتیان تەماشای هەواڵەکان بکەنو تەنها لەو ڕێگەیەوە باوەڕ بە ڕاستی ڕووداوەکان بکەن... زۆربەی کەسانێکیش لەو ڕێیەوە قازانجی مادیو مەعنەوی بکەن لەوانەیە بابەتێکیان بۆ بلاوبکرێتەوە کە زۆر لاوازە بەلام دوو سێ جار ئەو ناوە بکەنە مانشێتێكو یان تەوەرێکی سەرەکی لە بابەتەکەیاندا.

هێنانو نووسرانی زۆری ئەو ناوانەو تێکەڵ کردنیان دەگەڵ ڕووداوەکان زیاتر لەسەردەمی شۆڕشدا لە جێگەی خۆی بوو وە کولتووری شۆڕش بوو بەلام ئێستا لە قۆناغێکی تر داینو جەماوەریش بای ئەوەندە هۆشیار بوونەتەوە کە بابەتو ڕووداوو گۆڕانکاریەکان شی بکاتەوەو لێکیان بداتەوەو بە چاوی ڕەخنەو لێکدانەوە تەماشایان بکات.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مێژووی خەباتی زۆربەی سەرکردەکانی نەتەوەکەمانو کولتووری (بارزانی نەمر) دەبینین چەندە ماندووبوونو خەبات کردنو هەموو ژیانی خۆی بۆ ڕزگارکردنی میللەتی کورد تەرخان کردووە بەبێ ئەوەی کار بۆ ئەوە بکا کە چەند بناسرێو چەند ببینرێو چەند وێنەی بلاو بکرێتەوەو چەندە خزمەت بە نێوی ئەوەو بە میللەت بکرێ... بۆیە ئەو سەرکردەیە نەوەیەکی پەروەردە کرد کە لەسەردەمی ڕژێمدا نەوەیەك هەبوو کە تەنها وێنەیەکی ئەو سەرکردەیان نەدیبوو، بەلام ئینتمایەکی ڕوحی ئەوەندە بەهێزیان دەگەڵ هەبوو کە لەسەر حەشاردانو وەدەستکەوتنی وێنەیەکی ئەو چەندان کەس لەسێدارە دراون! وە چەندەها منداڵ هەنە کە لە زیندان لە دایك بوونە هەر لەوێشدا گەورە بوونە بە بێ ئەوەی وێنەیەکی ئەو سەرکردەیەیان

دیبێ، بەڵام بە گەورەترین سمبولی شۆڕش‌و خەباتی میللەت‌و سەرۆکی کوردیان دەزانی‌و تەنها بۆ ڕۆژێك هەتا ئێستاش لەو هەستە دانەبڕاون ئێمە دەبێ ئەو کلتورە نیشتمانیە زۆر بە زیندوویی بهێلینەوە هەوڵ بدەین بە هەموو لایەك لە کوردستان نەوەیەك پەروەردە بکەین کە هەمان پەیوەندی ڕوحی دەگەڵ سەرکردەکانی خۆی دروست بکاتەوە نیشتمانپەروەری لە ڕێگەی ئەو ئینتیما ڕۆحیەوە بە هێز بکەینەوە. نەوەکو نەوەیەك پەروەردە بکرێ کە نیشتمان‌و حکومەت‌و وەزارەتێك هی یەك کەسە بۆ نموونە ئەگەر هەر گۆڤارێك لەو گۆڤارانەی زۆربەی وەزارەتەکان‌و سەندیکاو ڕێکخراوەکان بلاّوی دەکەنەوە زیاتر لە بیست وێنەی ئەو وەزیرەو ئەو بەرپرسەی لێدراوە تەنها لە یەك ژمارەیدا، بەلاّم هەتا ئێستا گۆڤارو بلاّوکراوەی تایبەت بە شێوەیەکی بەردەوام بەناوی هەڵەبجە یان ئەنفال یان تەعریب کە لە ئاستی ئەو ناونیشانە گەورانەدا بێت‌و بۆ نموونە ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە بێت.

هەروەها لە ڕۆژێکدا هەموو کامێراکانی تەلەفزیۆنەکان لە هەندێك وەزارەتەکان، کە چەند میوان دەچن‌و چەند پرۆژە دەکرێنەوە چەند پێشانگاو کۆڕو سیمینار دەکرێن هەمووی لەیەك شەوو لە هەموو کەناڵەکانداو لە یەك هەواڵ نامەدا پیشان دەدرێ نەك بەمەبەستی شرۆڤەکردنی پرۆژەکە بەقەد ئەوەی نیشاندانی بەرپرسەکەیەو هەروەها زۆربەی پەیامنێرو وێنەگرەکان بۆ هەندێك بەرژەوەندی تاکە کەسی وێنەو مۆنتاژو پەیام لەسەر کاری تەنها وەزارەتێك‌و دائیرەیەك دەدەن.

له به‌شێكی دیكه‌ی بروسكه‌نامه‌كه‌دا نووسراوه (حه‌ز له‌و مه‌زاهیرانه ناكه‌م‌و بێزم لێی ده‌بێته‌وه) مرۆڤ كاتێك ده‌گاته پله‌یه‌كی به‌رزی باوه‌ڕ به‌خۆبوون هه‌ر به چاوێك بچووكترین دیارده‌ی نه‌شاز له نێو كۆمه‌ڵه‌كه‌یدا هه‌ست پێ ده‌كاو به‌ته‌نها دیموكراتیه‌ت بۆ خۆی دابین ناكاو وا له ئازادی تێناگات، كه له پێش هه‌موو كه‌س ده‌بێت ئازادی بۆ به‌رژه‌وه‌ندی‌و ناسرانی خۆی به‌كار بهێنێت‌و هه‌موو چه‌مكه‌كان له پێوانه‌یه‌كدا ڕاده‌گرێ (بێز لێ هاتنه‌وه) له حاڵه‌تێكی ڕۆحی هێنده گه‌وره‌وه هه‌ڵده‌قوڵێت كه مرۆڤ هێنده ویژدانی پاكه‌و به هه‌موو دیارده خراپه‌كان روحی تێك ده‌چێت ئه‌وه هه‌ڵوێستێكی نیشتمانی پیرۆزه كه مرۆڤ بێز له‌و دیاردانه بكاته‌وه كه ده‌زانێ كۆمه‌ڵگه‌كه‌ی به‌ره‌و دواكه‌وتن‌و داته‌پین ده‌به‌ن.

هه‌روه‌ها هه‌ڵوێستێكی گه‌وره‌یه به‌رامبه‌ر به میدیاو كاری ڕۆژنامه‌نووسی كوردی، ڕاچڵه‌كاندنی ڕاگه‌یاندنی كوردیه له‌و باره‌ی تێدایه‌تی به‌ره‌و ده‌رچوونی ڕۆژنامه‌ی ئازادو ڕۆژنامه‌یه‌ك كه ئه‌ركی هه‌ره گه‌وره‌ی هۆشیار كردنه‌وه‌ی نه‌وه‌ی نوێ‌و گه‌یاندنی په‌یامی ڕاسته‌قینه‌ی خۆی بێ.

ڕۆژنامه‌یه‌ك كه هه‌موو هاوڵاتیه‌ك هه‌ست بكا بۆ ئه‌و ده‌رده‌چێ مافی خۆیه‌تی هه‌موو ڕایه‌كانی خۆی تیادا بڵاوبكاته‌وه یا نوێنه‌ری ده‌ربڕی خواسته‌كانی بێت.

**ڕۆژنامەیەك كە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پەیامی سەرەكی نیشتمانپەروەری بێتو لە دوای ئەو بروسكەنامەیەدا دەست بە چاكسازی بكاتو ببێتە ڕۆژنامەی هەمووانو گەورەترین ژمارەی خوێنەر بۆخۆی ڕابكێشێت.**

## ئەو جەستەیەی بناغەی شانۆی کوردی لەسەر رۆدەنرێت

(ســەردەمی بێتــاوانی ســەردەمی بنیادنــانی شــانۆیی نەتــەوەیی‌و ئەکتەری کوردی)

دوای ئەو قەیرانە چڕەی کە دەقی شانۆیی‌و شانۆی کوردی تێکەوتبوو لەپاش ئەو ئابلۆقەیەی کە دەوری دەق‌و ئەکتەری شانۆی دابوو.. هەستت دەکرد کە هۆڵەکانی شانۆگەری تا دێ بەرەو خامۆش بوون دەچن.... چەند جەستەیەکی بێ گیان تیایاندا دێن‌و دەچن .... چەند دەقێکــی ئــەوروپی کۆپی کراونەتەوە، کە لەنێو هۆڵی شــانۆدا بینــەر خــۆی لێ ون دەبــوو.. تۆزی دارمان لەسەر پەردەو کورسییەکانی شانۆ نیشتبوو....

بەڵام ئەو دەرهێنەرە داهێنەرەو ئەو ئەکتــەرە بــە توانایــە... توانیــان مژدەی ئەوەمان بدەنێ، کــە ئێمــە خــاوەنی دەقــی ئــەوها پــڕ نــاوەرۆك‌و ڕەسەن‌و ئەکتەری ئاوا بە توانایین .. ئەو سێ ئافرەتە هونەرمەندە، توانای ئافرەتی کوردیــان پیشــانداین... (شــیرین مــەعازی-کــوبرا مەلــەکی... جەستەی خاتوو کوبرا مەلەکی)) وەکو ئاوێنە وێکڕا مێــژووی نەتــەوەی کوردو ڕەوە ڕاپەرین.. شۆڕشەکان‌و واقیعی ئەورۆی پیشان داین....

ئەو جەستە پتەوەی کە سەدان ئازادی‌و نسکۆ و.. سەرکەوتنی لە خــۆ گرتبــوو... لــە هــەموو شــوێنێك کاریگــەرتر کــە مێــژوو داهــاتووی

نەتەوەیەكی لە نێو جەستەی ئافرەتێكدا بینی.... جەستەیەكی پڕ مـانو ئازاو پەروەردەكراو بوو... هەروەها جـودا لـەوەی كـە مێـژووی میللـەتی كوردمـان لـەو جەسـتەیەدا دیـت.... بـە دڵنیاییـەوە دەڵـێم كـە زۆر سەركەوتووانە توانی (مێژووی ئافرەتی كورد) نمایش بكا... لە كـارێكی دوو كاتژمێریدا... نیشاندانی مێژووی نەتەوەیەك‌و تێكەڵ كردنی لەگـەڵ مێژوو كەلتوری ئافرەتی ئەو نەتەوەیە... كاركە جێگەی سەرسـام بـوون‌و بەرەو پێش چوونی هونەرو ئافرەتی كورد.

((زمان)) لەو دەقەدا زمانێكی زینەو قوڵ‌و پڕ ڕەمز بـوو... كـە زۆر كاریگەری لەسەر بینەر هەبوو... شێوەی گفتوگۆیـەكان‌و تێكـەڵكردنی دیالێكتەكانی زمانەكەیان ژمـاردنی ژمـارەی شـەهید و... ئـەنفال‌و .... جەنگ و.... شۆڕشانە توانایەكی ئەوەندە گەورە بـوو كـە دەكرێـت نـاوی بنێین ((داهێنان))

لەهەموو شتێك گەورەترو دڵخۆشتر بۆ من ئەوە بوو كە ئافرەتێكم بەو جەسووریەوە دیت كە توانیویەتی ئاوا بە ئازادی‌و بەو شێوەیە خـۆی پـێ بگەیێنێت.. ئەو هەموو قۆناغە سەختانە ببڕێ كە ئافرەتی كورد تێیدایەو بەو گەورەیە لە نێو هونەر دا دەردەكەوێت... ئەوە سەرەتایەكە بۆ پێنانـە ناو قۆناغێكی نوێ لە شانۆی كوردیداو ئەكتەری پێگەیشـتوو لـە نێـو شانۆدا.

هەروەها مێژووی ژنێكی وێـران‌و نەتەوەیـەكی وێـران كـراو لـە نێـو جەستەی ئافرەتێك ببینـی‌و لـە نێـو قـورگی ئافرەتێـك ڕا.... ببیسـتی كارێكە لەوپەڕی داهێنان‌و پێگەیشتنی ئافرەتە لـە نێـو ئێمـەدا.... لـە

ئاینده‌دا دونیا ده‌توانیٚ له‌ نێو جه‌سته‌ی ئه‌و ژنه‌وه‌و له‌ نێو قـورگی ئـه‌و ژنه‌ هونه‌رمه‌نده‌وه‌ ئافره‌تی کورد بناسیٚو ببینیٚو گوێی له‌ ده‌نگی بێت.

بۆ نمونه‌ که‌ گوێت له‌ ده‌نگی ئوم که‌لسوم‌و فه‌یرۆزو ماجیـده‌ رۆمـی ده‌بێت وا هه‌ست ده‌که‌یت گوێت لـه‌ ده‌نگـی هـه‌موو ئـافره‌تی عه‌ره‌بـه‌و کولتوری ئافره‌ت له‌و داهێنانـه‌دا ده‌بینـی... ئافره‌تێـك کـه‌ بـه‌ هونـه‌ر نه‌ته‌وه‌که‌ی به‌ دنیا بناسێنێت ده‌بێت جێگه‌ی سه‌ربه‌رزی بێت بـۆ ئێمـه‌و ته‌مه‌نای ڕووخۆشی بۆ بکه‌ین... بـۆ ئـه‌و هـه‌موو توانایـه‌ی کـه‌ بینـه‌ر هه‌ستی ده‌کرد تێکه‌ڵ بـوونی ده‌نگـی‌و ده‌نگـی ده‌فه‌کـه‌ کـه‌ به‌رامبـه‌ر ئۆپێرایه‌ك دانیشتوی... هێنـده‌ ده‌نگـه‌کان کاریگـه‌ریان له‌سـه‌ر ده‌روون‌و مێشکی بینه‌ر هه‌بوو... له‌ کۆتاییدا ده‌ڵێم کـه‌ ئـه‌و کـاره‌ بناغه‌یـه‌کی پته‌وه‌ بۆ بیناکردنه‌وه‌ی ئه‌کته‌ر له‌سه‌ر شانۆ... هه‌م قۆناغێکی نوێشه‌ بـۆ ئافره‌تی هونه‌رمه‌ند له‌ مێژووی کوردا....

٢٠٠٢

## عەشق و خۆشەویستی و دڵداری یەکن یا نا؟

گەلەك سەختە لەنێو ئەو سپڵەیەی ژیانی کورددا نەوەکو عەشق هەر برادەرێکیش پەیدا بکەی کە جێی متمانەو وەفاداری بێت.

بەدەر لەهەموو پێناسەو ڕۆچوونە فەلسەفی و توێکارو شیکارە زانستیی و دەروونیەکان، عەشق ئەو ڕووداوو گۆڕانکارییە بۆمبە جوانەیە کە کەس نازانێ لەکوێ و چۆن و کەی ڕوودەداو دروست دەبێ و دەتەقێتەوەو مرۆ گیرۆدەکا بێ هیچ جیاوازییەکی ڕەگەزی و ئەتنی و کەلتووری، مرۆ بەرەو جۆشیەکی بێئەندازەو ئاقارێکی لێڵ و پڕ تەنگژە دەبا..

عەشق و خۆشەویستی و دڵداری هەرسێکیان لەبۆ ئەو کۆمەڵە هەستە دەکاردەبەین کە پێیان دەڵێن (سۆزداری) جێگەیەکی هەستاریان هەیە لەپێکهاتەی هەستی و کەسایەتی و دەورێکی سەرەکی دەگێڕن لەکامڵبوون و نوماکردنی پێگەی هەر مرۆیەکدا، جێی سەرسوڕمانێش نییە، کە مرۆ هەیە تا دەمرێ هیچان بەخۆوە نابینی یا بەپێچەوانەوە لە یەك کاتدا دەکەوێتە ناو هەرسێك حاڵەتان بە ڕێژەی سەیر سەیر!

دەکرێ بپرسین مرۆ چەند جار عاشق دەبێ؟ ئەرێ عەشق چ سنووری هەیە؟ ئایا لە عەشقدا بەیەکگەیشتن هەیە؟ یا عەشق لەبەیەك

نەگەیشتن ڕا دروست دەبێ؟ ئـەرێ ئـەو دەمـەی عاشـق دەبـین چـاومان دەگۆڕێن یادەستەکانمان؟ دەبێ دڵ جێگای چەند عەشقی تێدا ببتەوە؟

ئایا لەعەشقکردندا هەڵبژاردن هەیە؟ دەبێ عەشق بەپێی کەسایەتی کەسەکان بگۆڕێ؟ عەشقبوونی کەس‌و خاك‌و شتەکان جیاوازیان هەیـە؟ چەند هێزی شاراوەمان لەخۆدا حەشارداوە بۆ عەشق کردن؟

عەشق‌و خۆشەویستی‌و دڵداری نەك هەر لەماناو چـەمکدا جیـاوازن، سێ هەستی تەواو جیاوازیشن لەناو ئەو کۆمەڵە هەسـتەی سـوزداریدا، لێ ئەگەر خوێندنەوە شیتەڵکردنێکی تایبەتیان بۆ نـەکرێ، ئـەوا هـەر دەکەونە ژێر یەك پێناسەو تێکەڵی یەکتری دەکرێن! ئەوەی دڵداری دەکـا خۆی پێ ئاشقەو ئەوەی خۆشەیستی دەکا لای وایە تەواو عاشـقە! ئـەوەی عاشقیشە پێی وایە دڵدارێکی هەیە!

عەشـق حاڵـەتێکی چـڕو تایبەتـە زۆر بۆچـوون‌و پێناسـەی قـووڵ لەخۆدەگرێ، وەها ڕوودەدا مرۆ تەواو دەپەشۆکێنێ کاریگـەری دەهاوێتـە سەر هەموو پێکهاتـەکانی کەسـایەتی‌و ژیـان، مـرۆ لـەناو هـەر دۆخ‌و پێگەیەکی ژیاندا بێ نابینا دەبێ‌و دەکەوێتە بەرەی قوربانیدان بەهەموو شێوازان، مرۆ تا نەگاتە لوتکەی عاشق بوون ناتوانێ بڕیاری قوربانیدان بداو دەست لە بەهاو نەخشەکانی ژیانی هەڵگرێ.

عاشق بوون لەگـەڵ هـەموو خاڵـە وێکچـووەکانی لـەنێوان هـەموو مرۆڤـەکانی سـەر ڕووی زەوی زۆر خـاڵی جیـاوازی لـێ وەدەردەکـەون، بەتایبەت لەنێوان هەردوو ڕەگەزی ژن‌و پیـاوداو بـە مانـای عەشـق زۆر کاریگەرانەترو قووڵتر کار لە هەسـتەکانی ژن دەکـاو ژنـان کـەمتر بـۆ

عەشق خۆڕادەگرن‌و زۆر بەقووڵی عاشق دەبن‌و دەکەونە بەرەی قوربانیدان، هەتا زۆر جاران لەناویشیدا بەکوشت دەچن‌و بە هیلاك دەچن، بەو مانایەی کوشتن لەسەر عیشق هەر ئەو کوشتنە نییە مرۆ لە خوێنێ گەوزێنێ‌و گیانی دەرچێ، کوشتنەکانی عەشق ڕەنگ‌و ناوی جیاواز لەخۆدەگرن.

خاڵی جیاوازی مابەینی عەشق‌و خۆشەویستی‌و دڵداری ئەوەیە کە مرۆ زۆر جاران کەسی بەرامبەر هەر جارێك دەبینێ یا هەرنەیدیوە، تەنها گوێی لەدەنگی بووە دەکەوێتە عەشقی‌و بەبێ هیچ بەرژەوەندی‌و بەرامبەرێك هەتا هەیە ئەو هەستە دەپارێزێ‌و پێی گەش دەبێتەوە.

عەشق پاش ئەوەی خۆ بەدڵدا دەکاو ڕەگ داوێتە ناو چاوو دەستەکان، ئەوانەی بەراستی عاشقن هەمیشە چاوو دەستی عاشقەکان دەناسن بە پێچەوانەی ئەوەی گەلەك گاڤان مرۆڤ بەوەی عاشق دەبێ نە دەیبینێ‌و نەدەستیشی دەیگاتێ!

هەرچەندە مرۆ ئەودەمەی عاشق دەبێ نەئاگای لە هیچە نا چاویشی هیچ دەبینێ، لێ دەبێ بای ئەوەندەی زیت بێت ئاشقی کێی‌و چۆن عاشق دەبیت، چونکە دەمی واهەیە عەشقی کەسێکی سادە لەبنی ئەو دنیایەی گەلەك پاکترو ڕاستەقینەترە لەهی خۆ بەرۆشنبیرزانێکی پوچهەڵگەڕاو....

دەبێ لەهەر جێیەکی تەمەندا بین وردورد لەدەستەکانمان بنۆڕین‌و بزانین عەشق تا کوێیان هاتووە، چەندیان گەرمی لەبەردا ماوە بۆ عاشقبوونێ.....

# کیژە گەریلا هێندەی چیای قەندیل نەمر دەبن

ژنـان وەختێـك دەبنـە شۆڕشـگێڕ، لـەناو شۆڕشـدا دەمێننـەوەو لـە شۆڕشـەکانی ناخۆیانـدا سـەردەکەونو بڕیـاری گـەورە دەدەن، وەك ئـەو بڕیارەی کیژانی چیای قەندیل لە ژیانیاندا داویانە، کە بەتەوژمێك پـاش ساڵانی هەشتا بـەپۆل بـەرەو چـیایەکان بـەڕێ کـەوتونو نەیانهێشـتوە چیایەکان چۆڵ بنو، بەپڕۆگرامێکی نویێو بەبەرنامەی نـویێو ئـەزموون لە هونەرەکانی جەنگ ئامێزیان لەچیاکان داوەتەوە، کە نزیکـەی چـەند سەد ژن وکیژێك دەبن بە پلەی سەربازی جۆراوجۆر سەرکردایەتی هێرشو ڕێخسـتنیان لـە ئەسـتۆیەو، شـەڕکەری کارامـەو ئازایـان تێـدا هەلکەوتوونو بەوپەڕی لێهاتوی بەرامبەر دوژمنان دەجەنگنو بەرگـەی ئابلۆقەی دەوڵەتانی دڕندەو هێرشەکانی کوردانیشیان گرتووە.

ئەو تۆکمەییـە روحییـەی کیـژە گەریلایـەکان دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو تۆکمەییە رۆحیەی تائێستا لە ناو ژنانی باکوردا پارێزراوە، بەشێوەیەکی گەلـەك جـوان رەنگـوەدەنگو سـیمای خۆیـان پاراسـتوەو دەسـتیان بـە رەسەنایەتیو زمانی خۆ وەگرتوە، بۆیە ئەگەر سەرنج لە شێوەی پۆشـینی جلكو بەرگیان، ئاخافتنییان، ژیانی ساکاریان لە گونـدەکان، پاراسـتنی کولتوورو هونەریان، ئەگەر سەرنجێ لە کەسایەتی ئەو کیژە گەریلایانـە

بدەین هەست بەپاكی‌و جوانییـــە خۆڕسكە دەكـەین، كـە ڕەنگدانــەوەی بەسەر كەسایەتییانەوە هەیەو، ئـەو بـاوەڕە گـەورە لـەناو چـاوەكانیاندا دەبینریٚ كە گەلەك بەزەحمەت لەنیٚو چاوی ژنەكی تردا دەدۆزریٚتەوە، كـە شانبەشانی چیایەكان خۆیان ڕاگرتووە، هەرەوەها هەندیٚكیان لە ئەورووپا ڕا گەڕاونەتەوە بۆ خەباتكردن، لەوەدەمەیدا ئەورووپا بۆتە بەهەشـتیٚك بـۆ ژنــانی كــوردو بــە بەهەشــتی ئازادییــەكانی ناوزەدەكـەن بـۆ پۆشــینی جلوبەرگ‌و پاراستنی ژیانیان، ڤیٚجا بەو پیٚشـینە ڕەسـەنەیانەوە شـانیان داوەتە بەرخەبات لە كایـە سیاسـی‌و ڕۆشـنبیری‌و كۆمەلاَیەتییەكانـداو، توانیویانە بەشارەزایی مامەلَە دەگەلّ پیٚشكەوتن‌و تەكنۆلۆژیا بكـەن‌و، بە شارەزایی تیٚكەلّی ژیانی مەدەنی‌و ڕیٚكخراوەیی بن، ئەگەرچی لە زۆر لەپارچەكانی دیكەی كوردستانیٚ، ئیٚستا ڕەوشی ژنان هیٚندە خەمهیٚنەرە كە دەكریٚ بیٚژین لەهەندیٚك حالّەت‌و كەسایەتی بـەدەر، دەنـا ئـەوی دی هەموو هەر تۆزوبایەو بەرەو هەلّدیٚرانی ناوو میٚژوو دەڕواو مل دەنیٚ، ژن هیٚندە بچووك كراوەتەوە ڕۆژانە هەر خەریكی خۆ ڕازاندنەوەی دەمووچاوو جەستەیەتی‌و، خۆئامادە دەكا لەبۆ ئەو بازرگانییەی پیٚـوەی دەكـریٚ بـە جۆرەها چەكی بیٚدەنگ دەكوژریٚ.

ئەو شۆڕشە ئەگەر هی هەر میللـەتیٚكی كـەی دنیـا بوایـە پیٚگـەو سەدایەكی تری دەبـوو، بەشـیٚوەیەكی چـڕتر تیٚـی دەڕوانـراو حسـیاباتی نیٚودەولّەتی گەورەی بۆدەكرا، لیٚ چونكە كورد نەتەوەیەكی خۆبەكەمزانە ناتوانیٚ گرنگی‌و تایبەتمەندی ئـەو شۆڕشــە بەبایەخــەوە وەرگـریٚ، وەكـو هیٚزیٚك لە هاوكیٚشەكاندا دەكاری بەریٚ، بۆیە هەر ڕۆژە بە دلّی دەولّەتیٚك

بێبەری لەو شۆڕشە دەکاو بەگێرەشێوێنیان پێناسەدەکا، ئەوە لەسەر ئاستی سیاسی، هەروەها لەسەر ئاستی رۆشنبیریو جڤاکیدا بەهەمان دید هەموو ناوو ئاماژەیەكو هاوسۆزیەك بۆیانو دەگەڵیان هەلاوێردکراوە، تا ئێستا لەناو ئەو هەموو خرتوخاڵەی بەناوی کتێبو گۆڤار دێنە وەشان، بابەتێك وەدەست ناکەوێت کە بەتایبەت لەسەرئەو شۆڕشەو ژنی گەریلا نووسرابیٚو زانیاری چڕوپڕی تێدابیٚ.

هەروەها هێندەی ژنی رۆژئاوایی بەدواداچوونو زانیاری هەیە لەسەر ئەو شۆڕشە چەکداریەی ژنی کوردو، هێندەی وتارو بابەتی ئەوان لەناو رۆژنامەو گۆڤارەکاندا لەسەر ئەو پرسە دێنە وەشاندن، هەرگیز لەلایەن ژنە نووسەرێکی کورد ئەو شۆڕشە جێی پرسو بایەخ نەبووە، بەتەنها لەسەردەمێك نەبیٚ، هەندێك نووسەرو هونەرمەند خۆیان خزاندە ریزەکانیانو کەوتنە پێدا هەڵدانیان، پاشان ئەگەر لێیان ڕوون بوو ئەوان جێگای خۆدەرخستنو خۆڕانانیٚ نین ڕوویان لێوەرگێڕان.

ئەگەر پتر رۆچینە ناو ئەو پرسە، هەست دەکەین نەمری ئەو کیژانە لە وەدایە، کە لەسەدەی بیستو یەکەمدا لەوەدەمەی زۆربەی ژنانی دنیایە بەتایبەت وڵاتانی ئەورووپی خەریکی خۆشترکردنی گوزەرانی خۆیانو، پتر چەسپاندنی مافە کەسییەکانی خۆیانن، تا چۆن پەیوەندییە هەمەجۆرەکانیان لەگەڵ پیاوانی هەمەجۆرو هەمەڕەگەز رێك بخەن، بۆ ئەزموونی ژیانو پێشکەوتنو قازانجو پێکەوەنانی سەرمایەو ناوبانگ پەیداکردنیان لەگەڵ ڕەگەزێکی جوداو، لەگەڵ کولتوورێکی جودا بەدەر لەخەمی خاكو بەدەر لەخەمی زمان، هەر بۆ خۆشی ناسینی

کولتووریکی دیکه خۆ فێری چەند زمانان دەکەن، بێ ترسی هیچ فیشەكو هیچ کەمینێك بەسەرانسەری دنیایەدا دەخولێنەوەو دەگەڕێن‌و، زۆربەشیان بە ژنانی ولاتانی دەوروبەرو کوردستانیشەوە سەرقاڵی نەشتەرگەری جوانکاری لەش‌و جەستەیانن، ئەوان لەسەر ترۆپکی چیایەکان بەرامبەر بە دەوڵەتێکی دیکتاتۆری وەکو تورکیاو، زلهێزێکی وەکو ئەمەریکا دەجەنگن‌و، لەناو سەنگەرەکانیاندا سنگیان بۆ گوللە ئاوەڵادەکەن، لەبۆیە ئەو کیژە گەریلایانە پێویستە جێگای شانازیە بن بۆ هەموو کوردێك‌و بەتایبەت ژنانی کورد.

ئەو شۆڕشە تاکە شۆڕشێکە ئەورۆ لە دنیایەدا بەو چەندایەتی‌و چۆنایەتیەوە ژنی تێدا بەشداربێ، ژن بگاتە ئەو ئاستە بەرزەی لێهاتووی لەسەرکردایەتی کردن‌و بەشداریکردن لەهێرشەکانداو، شارەزایی لەهونەرەکانی جەنگدا.

هەموومان دەزانین شەڕی زمان‌و شەڕی خاك شەڕێکی مەزنەو خوێنێکی زۆر لەوەی پتری دەوێ، کە تا ئێستا کورد ڕشتویەتی، شەڕی زۆر خەتەرترمان لەپێشماون دەبێ ئەو شۆڕشە بەهەموو شێوازان پشتگیری بکرێ، دەنا زەرەرە مێژووییەکان دووبارە دەبنەوەو لێ سەختر لەوەی چاوەڕێی دەکەین.

لەبۆیە لە دووماهیەدا دەبێژم ئەو کیژە گەریلایانە وەکو چیایەکانی کوردستانێ بە پاکی‌و بەنەمری دەمێنەوەو ناوو ڕەنگیان بەهیچ هێزێك ناسڕدرێتەوەو بزرنابێ، هانگاوەکانیان نیشانەی سەربەخۆییەکی خۆڕسکی کوردانەیە.

## تیرۆستان گەراکانیان لە هەولێردا تروکاوون!

لە پاش ئازادکردنی عیراق دەرگایەکان لەسەر مەیدانێکی گەورەی ئیرهاب ئاوەلاّبوونو خرانە سەر پشت... تیرۆر بە هەموو جۆرو شێوازو کەرستەیەکیەوە چەکەرەیەکی بەرچاوی کردو تیرۆرستان رەگیان بە ناو عیراقدا هاویشتو لەناوەوەی عیراقیش سەریان دەرهێناو عیراق بوو بە بەرەی گەورەی ئیرهاب.

تیرۆریستان بەرە بەرە لە کوردستانیشدا سەریان دەرهێنا لەناو هەورامانو دواتریش لە شاری هەولێر بوو بە مەیدانێك زنجیرەیەك کاری تیرۆرستی تێدا ئەنجام دران بەلاّم لەدوای ئازاد کردنی عیراق بۆیەکەمجار کارێکی تیرۆرستی بە چەندایەتیو چۆنایەتیەوە لە ((١))ی رێبەندان لەشاری هەولێر سەری هەڵداو وەدەرکەوت کە بەهۆی خۆ تەقاندنەوە بوو لە هەردوو بارەگای لقی ((٢))و مەڵبەندی ((٣))، بۆیە هەتا ئێستاش عیراق بۆتە خاکێك تیرۆرستان پەنا دەداو زۆربەی کەشو سکراکتوری کۆمەلاّیەتی شاری هەولێریش دەبێتە حەشارگەو هۆی گەشە پێدانو رێنماییان دەکا.

دەبێت لەپاش ئەو کارەساتە بەڕاستی دەست بۆ هەڵەو مۆڵگەکان راکێشینو بەڕاشکاوی لەسەریان بدوێین.

دەبێت لە خۆمان بپرسین ئەگەر چاوساغێکیان نەبێ نەخشەکانیان لە پێش ڕاخاو چراکانیان لە بۆ هەڵکا... چۆن وا بەئاسانی دەگەنە ناو دڵی هەولێرێ....!

دەنا هەر کەسێك کە بۆ یەکەمین جار دەچێتە هەر گوندێك نەك شارێك لە هیچ شتێکی ئەو شارە چ نازانێ‌و بە کوێرە ڕێیاندا دەڕوا بە پرسیاران خەڵك هەراسان دەکا.... پرسیار دەربارەی هەموو بارو دابوو نەریتێك دەکا ئەوجار زمان‌و ڕێ ڕۆیشتن‌و مامەڵە بە پارەو سەرو چاوی نامۆن بە هەموو خەڵکی ! ئەوە ئەگەر وا دابنێین موسافیرێك بێت بۆ هەر کارێك یا بۆ گەشتێك ڕوو بکاتە شارێکی غەریب بەڵام ئەگەر ئەو کەسە تیرۆرستێك بێت! دەبێ دە ئەوەندەی زانیاری‌و پرسین پێ بێت! بە ترس‌و گومانیشەوە هەڵوەستە لەسەر پرسەکانی بکاو چەند دەپەشۆکێ‌و دڵە ڕاوکێ دەیگرێ....

نزیکترین نمونەئەنجامدەری کارە تیرۆرستیەکەی هەولێرێ وایدابنێین لە دەرێ هەولێر ڕا ئەوێ ڕۆژێ هاتۆتە ناو هەولێرێ: چۆن یەکڕاست ئەو جێگاو شەقام‌و مەڕاسیمەی پێشبینی کردووە! چۆن پێشبینی کردووە کە پشکنین لە دوو بارەگای وا گەورەدا لەو ئاستە دایە! چۆن دەیزانی ئامانجی خۆی ڕێك لەبەردەم کەسی دیاری کراودا دەپێکێ!

دووەم ئەگەر ئەو تیرۆرستە چەند ڕۆژ پێشتر لەناو هەولێرێدا بوبێ حەتمەن لە جێگای ئەمین‌و خاترجەم بووە. لە پاش دڵنیابوونیشی لە چۆنیەتی مەڕاسیمەکان‌و ئاستی پشکنینەکان هەموو بارودۆخەکان ئەوجار دەستی بە کار کردووە! بۆیە دەڵێم حەتمەن باگراوندێکی ناوخۆ لە

پشت هەموو کارە تیرۆرستەکانەوەیە، کە دەبێ ئێمە ڕاڤەو شیکاری هەمەجۆر مانا لەسەریان هەبێ نەوەك تەنها وەکو کارەسات‌و ڕووداو بەسەرماندا تێ بپەڕێ...

دەبێت شەقامی کوردی چۆن ئیدانەی ئەو کارەی کرد، بە هەمان گوڕو هەڵچونەوە وەخۆ کەوێ تا ڕەگ‌و ڕیشەی تیرۆرستان‌و تیرۆردۆستان لە کوردستاندا هەڵکەنێ‌و ماڵی تیرۆر حەشاردەران ئاگر بدرێ.

دەبێت هاولاتی ئەوەندە هۆشیار بکرێتەوە بزانێ کە ئەوە یەکەمین کاری ئەوە لە پێش ئەوەی کاری هیچ دەزگایەك بێت... زۆر بەداخەوە کە تاکی کوردی وا پەروەردە بووە وا ڕاهاتووە لە بۆ هەموو شتێك هەر چاوی لە حکومەتە هەموو شتێك هەر لە دەزگاکانی دەوڵەت داوا دەکا هەتا چاوەڕێ یە ژیانی ئەمنیشی لەناو ماڵەکەی خۆیدا بۆ بپارێزێ بۆخۆی تەنها چاویش نەگێڕێ.

بەڵێ کاتی ئەوە هاتووە چاوی هەر تاکێکی کورد سەنگەرێك بێت بەرامبەر بە تیرۆرستان...

دەبێ بای ئەوەندە هۆشیار بوبینەوە کە تیرۆر وەکو هەوا دێتە نێو ماڵ‌و دەزگاکانمانەوە دەبێ پێش ئەوەی هەست بە سێبەرەکەشی بکەی بیتوێنیەوە...

من داوا لە ڕۆشنبیرانی کورد دەکەم وەخۆ کەون‌و سەنگەرەکانیان ڕابگەیێنن با تەنها چاویان لە سیاسیەکان نەبێ بە تەنیا سەنگەرەکانی تیرۆرمان بۆ هەڵچن‌و لە ناویدا بجەنگن چونکە تیرۆر جەنگێکە بەرگری کردنی بە تەنها بە سیاسەتی ئەمنی دەوڵەتان ناکرێ....

ئەوە جەنگێگە دەبێ هەموومان لەبەرەی دابین بە بێ جیاوازی هەموو دەبێ پێشبینی ئەو گۆڕانکاریانە بکەین کە لە نەخشەی تیرۆرستاندا دەکرێ بۆ نمونە لەوانەیە ئەوجارەیان تیرۆر لە ڕێی ئافرەتێکەوە یا منداڵێکەوە ئەنجام بدرێ‌و بتەقێتەوە لە ناو هەر جێگایەك كە بە تەڵەکێکەوە خۆی بگەیەنێنێ! بەڵام دەبێ پێش ئەوەی ئەو دەست بوەشێنێ ئێمە دەستی خۆمان بوەشێنین!

## دەزگاکانی ئەمنی لە چ ئاستێکدان؟...

سیاسەتی ئەمنی بە کۆڵەکەی پشتی هەر دەوڵەت‌و دەسەڵاتێك دادەنرێ دەزگا ئەمنی‌و موخابەراتیەکانیش بودجەی تایبەت‌و حیساباتی وردیان بۆ تەرخان دەکرێ جۆرەها تەکتیك‌و تەکنیکی پێشکەوتوو تەکنەلۆژیای بۆ ئامادە دەکرێ...

هەرێمی کوردستان بە پێی ئەو بارودۆخەی هەیبووە لە ناوەخۆو لە دەرەوە توانیویەتی بۆ چەند ساڵێك هێندەی ئەو دەسەڵاتەی هەیبووە ئاسایش بۆ هاولاتیان‌و میوانانی دەستەبەر بکاو ئارامیەکی نمونەیی دابین بکا...

بەڵام لە پاش ((١١))ی سێپتێمبەرو دواتریش ڕزگارکردنی عیراق زۆر زروفی نوێ هاتنە کایەوە بە تایبەتی لە دەوروبەرو ناوچەکەی ئێمەدا عێراق دوای سی ساڵ پەستاوتن لە پڕ لە هەموو ڕوویەکەوە کرایەوە بۆیە بۆ بە بەرەیەك بۆ ئیرهابیەکان‌و جۆرەکانی تیرۆر....

دیاره دەزگا ئەمنیەکان لە توانایاندا نەماوە پێش بەو جۆرە بەربلاۆەی ئیرهاب بگرنو پێویستیان بە داڕشتنەوەی سیاسەتی نویێو هەروەها تەکنەلۆژیاو زانیاری ورد هەیە لەسەر هەموو پێشهاتەکانی لەو ناوچانەدا ڕوو دەدەن.... لەسەر هێزەکانی هاوپەیمانان پێویست بوو .

زانیاری ئیستیخباراتی دروست بدەنە دەزگا ئەمنیەکانو زانیاری لەسەر جۆرەکانی چشکنینو کارە تیرۆرستیەکانو تەکنیکاری نویێ بدەنە حوکمەتی هەرێمو نەوەکو تەنها سەلامەتیو زیندوو مانەوەی خۆیان یەکەم ئامانجیان بێو هەر لە حالەتی خۆپاریزی دا بمێننەوە بەلاٌم ئێمەی کورد لەپاش بیست سالێ دیکە لە سیاسەتی ئەمریکی تێدەگەینو زۆر شتمان بۆ ڕوون دەبێتەوە ئەودەم خوێندنەوەیەکمان بۆ قۆناغی ئەوڕۆمان وەدەست کەوێو بزانین ئەوان لێرە چ کارێکیان کردووە چۆن سیاسەتی ئەمنی خۆیان پاراستوەو جیاوازی نێوان سیاسەتی ئەمنی ئەوانو دلێ سافی خۆمان بۆ وەدەرکەوێ!

دیارە دەزگاکانی ئاسایش توشی واق وڕمانێك بوینە لە چاوو ئەو ئیرهابە نێودەولەتییەی کە تیرۆری بە هەموو جۆرێکەوە هێناوەتە ناومان هۆشیاری ئەمنی نە لە دەزگاکان نە لە نێو هاولاٌتیاندا ناگاتە یەکی دەی پێشکەوتنو شێوازو کەرستەکانی تیرۆرو بۆیە جیاوازییەکە لە نێوان دا زۆر زۆرە کە بۆتە کەلێنێكو هەلوێستەیەکی گەورەو خێرایی پێ دەوێت...

بۆیە دەبێ سەنگەرەکانی تیرۆر هەموو دەمێ لە گۆڕانکاریدا بنو بودجەیەکی تایبەت بۆ دەزگا ئەمنیەکان دابین بکرێ.... لێکۆلەرەوەکان

کاریان پێ بکرێ بۆ نموونه/ زانیاری لەسەر وێنەی تیرۆرستەکەی ١ی ڕێبەندان دەبوایە خەڵاتەکە مەبلەغەکەی دیاری بکرابایە بۆ نمونە دوو ملیۆن دینار ڕاگەیانرابا و هەروەها زەمانەتی ژیانی کەسی هەواڵدەر لە ئەستۆ گیرابا!

چونکە ئێستا لەودیوو لەو دیوی ماڵەکانمانەوە کەسانێك هەن دەژین تەنها سەلامەتی خۆیان تاکە ئامانجیانە لەو ژیانە دەبێ لە دوای ١ی ڕێبەندان هەموو شێوازو کەرستەو سیستەمەکان بگۆڕدرێن.

کاتژمێر بە کاتژمێر لە گۆڕاندایین لە شێوەی تەقلیدا ئەسوڕێینەوە پاداشتو خەڵاتو جۆرەها پاداشت لەسەر ئەركو هەواڵو ئەنجامەکانی دیاری بکرێن...

دەبێ میللەتی کورد بزانێت پێشکەوتووترین چەکی بایەلۆژی کە کیمیایی بوو لەسەر کوردان تاقی کرایەوەو خەتەرترینو پیسترین تیرۆریش هەر لەسەر ئێمە تاقی کرایەوە!

## ئیرهاب لە چ جۆرە کۆمەڵگایەك ڕەگ دادەکوتێ؟

دیارە بە جیهانبوونی ئیرهاب ڕۆژ بە ڕۆژ سەراپاگیر دەبێ دەچێتە نێو هەموو کیشوەرو دەوڵەتو کۆمەڵگایەکەوە... بەڵام ئیرهاب لە جۆرە کۆمەڵگایەکی تایبەت بەخۆیدا پتر پەل دەهاوێو ئامانجی گلاوی دەپێکێ وەکو وڵاتانی جیهانی سێیەمو کۆمەڵگە داخراوەکان... ڕێك لەگەڵ کلتورو فەرهەنگی دواکەوتودا خۆی تێکەڵ دەکا بۆیە عیراق یەك لەو نمونانەیە لە پاش ڕزگارکردنی تایبەتمەندیەکی تێدا دروست بووە بۆ

جۆرەکانی ئیرهاب سەرهەڵدان‌و بەرەو پێش چوونی! هەر ئەوەندە دەبینی ئافرەتێك لەچکێك بەسەری دادەداو پیاوێك هێندێك ڕدێنی دێڵێتەوە تەواو ئازادە بۆ کوێ دەچێ بچێ چ دەگەڵ خۆی هەڵدەگرێ بۆچوونی گشتی هاولاتیان لەسەری دروستە هەروەها لەزۆربەی هەولێریشدا هەمان تێڕوانین هەیەو ئەوانە دەبنە پردێك دەتوانی پییایاندا بپەڕیەوە جا هەر ئامانج‌و مەبەستێکت هەبێت! هەر گەرایەك بڕێژی!

ڕۆشنبیری ئەمنی "ئەورۆ بۆتە زەرورەتێك دەبێت بە زووترین کات کاری لە بۆ بکرێ خولی تایبەتی بۆ بکرێتەوە هەروەها پێشانگای تایبەت بکرێتەوە لەسەر جۆرەکانی تیرۆرو ئەو کەرستانەی پێشبینی دەکرێ پێی ئەنجام بدرێ.

چەندین کتێب‌و نامیلکە چاپ بکرێن بەسەر قوتابخانەو گەڕەك‌و دەزگاکاندا دابەش بکرێن.

خەڵك ڕابچڵەکێنن کە لەناو شارەکەیاندا خەریکە چ ڕوو دەدات‌و کێ جێی دەبێتەوە.

پێویستە هەر کارێکی تیرۆرستی ئەنجام دەدرێ لە پاشان هەموو وردەکاری‌و زانیارییەکانی بۆ خەڵکی کوردستان ڕوون بکرێتەوە هەر لە چۆنیەتی ئەنجامدان‌و جۆری ماددەکەو هەموو ڕێگەو وسائلی ئەنجامدانی کارەکە نەك ئەوانە هەر بە نهێنی بهێڵرێتەوە هاولاتیان ئاگاداریان نەبێ لەسەریان!

زۆرن ئەو پیاوە ئازاو مەزنانەی ناتوانن لە بۆ ڕۆژێکیش ئاسوودەیی‌و حەسانەوە بەخۆیان ڕەوا ببینن لە ڕۆژانی پشوو بۆنەکانیشدا هەر

خەریکی خەبات کردنو تێکۆشانو کارکردنن بۆ ئازادیو بەرەو پێش چوونی میللەتی خۆیان...

ئەو پێشمەرگە ئازایانەیی چاونەترسو لە خۆ بردوو لە ژیان بوردو لە هیچ قۆناغێك لە قۆناغەکانی خەباتداو لە ئیدارەو بەڕێوەبردندا ناتوانن بگۆڕێن...

ئەو پێشمەرگانە نە هیچ پۆستێکی ئیداریو نە هیچ جلو بەرگێکی مەدەنیو نە هیچ ناوبانگو شۆرەتێك ڕێگا لە پێشمەرگایەتیان ناگرێو هەر بە هەمان ڕۆحی پاكو سادە دێنە ناو ڕیزەکانی جەماوەرو بە گەرمییەوە دەست لە نێو دەستیان دەگرن...

ئەو کۆمەڵە کادیرە پێشمەرگەیە لە کادیرە هەرە هەڵکەوتووەکانی ناو شاری هەولێری ناو بزووتنەوەی سیاسی کورد بوون.. زەخیرەیەکی دەوڵەمەندی کوردایەتی لەناو مێشکیاندا هەبوو جێگاشیان هەر خاڵی دەمێنێتەوە...

دیارە میللەتی کورد زۆر پیاوی ئاوا ئازاو زیرەکی لەدەست داون، بەلاّم ڕۆژێك لە تێکۆشان سارد نەبۆتەوە، بۆیە داواکار م لە سەرۆکایەتی حکومەتی هەرێم لە دەروازەی شاری هەولێردا مەزارێك بۆ شەهیدانی فیدراڵی بە زووترین کات دەست پێ بکا مەزارێك کە لە ئاست گەورەیی ئەو شەهیدانە دابێت، هەر کەسێك بێتە ئەو ولاّتە تاجە گوڵینەی خۆی لەسەریان دابنێ.

٢٠٠٤

# هەڵدێری سیاسی

زمانی سیاسی کورد زمانێکی پێشکەوتوو نییە، دەبێ کەسانی سیاسی کورد چەند هەنگاوێکی بەبڕشتو بە بنەما هەڵنێو تیکڕایی درزەکانی بگرێ.

هەڵدێری زمان: ئەگەر زمان لە بۆ هەموو مرۆڤێك کاکڵەی کەسایەتیەکەی بێ، لە بۆ سیاسەتمەدارەکان گرنگترین پێکهاتەی کەسایەتییەکەیەتی، هەمیشە ئەو مرۆیانەی لە زمانو کۆپێ کردنیدا زۆر کارامەن، لە پۆستە سیاسیەکاندا دەگەنە ترۆپکی دەسەڵاتو هەتا هەن لێناکەون. زمانە پێگەیشتوەکان بەناو هەر کایەیەك بکەون ترسیان نییە لە ڕەتەڵدانو دۆڕاندنێو، بکەونە ناو هەر تەنگژەیەك دەمو دەست بە زمان خۆی لێ قوتار دەکەن.

زمانی سیاسی هەندەك دەمان دەبێ هێندە تیژ بێ، کوێندەری مەبەست بێ بیگاتێو بیپێکی، بەبێ ئەوەی کەس هەستی پێ بکات.

مرۆ کە نەیتوانی زمانی بە جۆرەها شێوازو زانست پەروەردەبکاو دەوڵەمەندی بکا، ڕاستەوخۆ دەکەوێتە ناو هەڵدێری زمان، دەبێ مرۆ زمانی وەها ڕابهێنێ، کە هەر دەم ویستیو چۆنی ویست وای بوەشێنێ و، لە وشەگۆرکێو ڕستەگۆرکیدا توانایەکی بێ سنووری هەبێو، هیچ

کاتێك زمانی دانەمێنێ. چونکە زۆر مرۆڤ هەنە هەنگاوی زۆر بەرین هەڵدێنن لە ژیانیاندا، لێ زمانی خۆیان پێ رانایەتو، لەو دەمەیدا دەیانەوێ بە ئاقارێکیدا زمانیان ئەو ڕێیە ناگرێ دەگەڵیانو هەڵدەدێرین..

زمانی سیاسیەکان دەبێ وەها رابهێنرێ لە چرکەیەکدا بە چەند دیواندا هەڵگێڕو وەرگێڕی بکا، بەبێ ئەوەی بچوکترین شوختی پێوە دیاربێ.

زمان کە چووە نێو سیاسەت زۆر سنوری ورد هەنە دەبێ نەیانپەڕێنیو، بە وشەی تایبەت لە ئاقاریان کەوێ . هێندەك وشە هەنە دەبێ هێندەی خۆیان بە ڕوونی دەربڕێنو، هەندەك وشەی تریش پتر لە خۆیان بە ڕوونتری بهێنە سەر زمانو دەربڕینی .

تێکەڵاوکردنی زمانی گفتوگۆو زمانی پەیام، زمانی دانوساندنیو زمانی چاوپێکەوتنان یەکە لەو هەڵدێرانە، زمان کە زمانی سیاسیەکان تێیدەکەوێ. چونکە دەمی وا هەیە سیاسییەك چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەنووسی دەگەڵ دەکرێ، لێ بە زمانی پەیام دانێ دەدوێو، زمانەکەی هێندە مەیوە کە کرۆکی بابەتێکی گرنگ لە دەست دەدا.

زمان خەسڵەتگەلێکی هەن مرۆ لە هەر پلەو پایەیەك دابێ نابێ لێیان خافڵ ببێو، زمانی هەڵباوسێ بە شتگەلێکی دوور لە زانستی سیاسیو ئەزموونی سیاسی، زمانی سیاسیی نەتەوە بندەستەکان زمانێکە هەڵاوساوو بە شانازیو بە خۆهەڵکیشان بە وتنەوەی وتەی فەیلەسوفو زانا ناودارەکان.

کاتێك بە قووڵی لە زمانی سیاسی کورد دەفکرین، هەست دەکەین بە دەگمەن نەبێ کەسایەتییك هەڵنەکەوتووە، کە خودان زمانێکی سیاسی تایبەت بە خۆی بێو، شارەزایی تەواوی لە زمان وەشانێدا هەبێو توانیبێتی دەگەڵ هەر شاند نێردراو. کەسایەتیەکی سیاسی، سەرۆك دەوڵەتێك زمانێکی جیاوازو تایبەتی هەبووبێو، ئەو وشەو دەستەواژانەی بێژتبن کە لە سەرچاوەیەکی قووڵی باوەڕ بەخۆ بوونەوە هەڵقووڵابن ، چونکە شارەزا سیاسیی و دیبلۆماسانی دەوڵەتە پێشکەوتووەکان هێندە کارامەن لە کاری خۆیان، کە مرۆ زمان هەڵێنێ دەزانن کەسایەتی سیاسییان بایی چەندەو چەند شارەزان، لە زمانیان ڕا تێدەگەن چەندە باوەڕیان بە خۆ هەیە. لە بۆیە بەر لە هەر هەنگاوێکیان لێکۆڵینەوەی تەواو لەسەر زمانی ئەو سەرکردانە دەکەن، کە جڵەوی سیاسیی نەتەوەیەکیان بەدەستەوەیەو پاشان بڕیار لەسەر پەیوەندیو گۆڕانکارییەك دەدەن لەگەڵیانو بەرامبەریان.

زۆر سیاسی زمانیان دەسوێو، چەند وتارو پەیامیان هەنە لە هەموو ڕووداوو بۆنەیەك بەیەك جۆرە وشەو دەستەواژان بەڕێی دەکەنو دەکەونە هەڵدێری زمان.

لێرەڕا ئەگەر قووڵتر سەرنجێ بدەین ئەو هەڵاوسانە سیاسییەی کورد توشی هاتووە جێی ترسو خەمێیە ئەگەر کورد لێێ وەخۆ نەکەوێ ئەنجامی خراپی لێدەکەونەوە.

**هەڵئاوسانی سیاسی:**

کورد بەرە بەرە خەریکە لەو چەپاندنە سیاسییەی بەرێ کە ئاماژەم پێداوە رزگاری دەبێ، لێ ڕووەو قۆناخێکی دی دەڕوا، بەڕای من ئەویش هەڵئاوسانی سیاسییە، چۆن دەبینینن کە جۆرەها گروپ‌و کەسایەتی بێتوانا خزێنراونەتە مەیدانی سیاسی، کە خودان هیچ ئەزموونێکی سیاسیی نین‌و بە تەنها دەرئەنجامێکن بۆ ئەو گەڕەلاوژە سیاسییەی کە کورد تێی کەوتووە، کە پاشان بە چڕی دەگەڕێمەوە سەری.

هەروەها زمان یەکە لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی ئەو هەڵئاوسانە، چونکە زۆربەی سیاسییەکان بە کەیفی خۆو بە پێی ئەو زانیارییە کرچ‌و کاڵەی کە هەیانە پەیامی سیاسی دەدەن، بەبێ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی نەتەوەیی‌و، هەر کەس لەبەر خۆی زمان دەوەشێنێ‌و بۆ بەرژەوەندی خۆی چی مەبەستە دەیبێژی، لە بۆیە جێی خۆیەتی کە بڵێین سیاسەتی کرچوکاڵ هیچ کاتیك ڕەخنەیەکی دروستی لێوە بەرهەم نایەت‌و، تەنها وەکو دروشمێك ڕەخنە دەجونەوە، لەبەر هەندێ لێرەڕا چەند تیشکێك دەهاومە سەر ڕەخنەی سیاسیی‌و چۆنیەتی نماکردنی.

**ڕەخنەی سیاسی:**

رەخنەی مەزن بەرهەمی مرۆڤی پێگەیشتووو خودان ویژدان‌و بیرمەندو ئازاو رۆشنبیرە، زۆر مرۆڤ هەنە لە ئەنجامی رەخنەی مەزن پێدەگەن، لێ کەم مرۆڤ دەتوانن رەخنەی مەزن وەبەرهەم بهێنن، رەخنەی

بنیادنەر ئەگەر نەشیتوانی پرسێك یا مرۆڤێـك بنیـادنێ‌و پێبگەیـەنێت دەتوانێ لەبنڕا هەڵیتەکێنێ‌و هەڵیوەشێنێتەوە

بەر لە هەموو ڕەخنەیەك ڕەخنەی فیکری جێی وروژاندنێیـە، پاشـان ڕەخنـەی سیاسـی دەخەینـە بـەر هەنـدێك سـەرنج، یـان لـەناو هـەر میللەتێکدا گەلێك زەحمەتە بێ ڕەگ داکۆتانی ڕەخنەی فیکری، ڕەخنـەی سیاسیی پەلوپۆ و سەریهەڵدا.

لە نێو میللـەتانی بندەسـتدا تـەنها دوو جـۆر خوێندنـەوەو بـە دوو دیواندا لە ڕەخنە دەڕوانن. یەکەکیان زۆر زەق کردنەوەو پێدا هـەڵگوتنی بابەتێك یا گوتارێك یان کەسـێکە یـا تێکشـکاندن‌و قێـزەوەن کـردن‌و دژایەتی کردنییەتی.

مشەخۆرانی ڕەخنە زۆر بەوردی سەرنج داوێنە سەر هەر هەناسەیەکی نوێ‌و قەڵەمێکی جیـاواز، روئیایـەکی نوێخوازانـەو زانسـتی سیاسـیی، فیکری سیاسـی‌و ئـەخلاقی سیاسـی لەناویانـدا هێنـدە پاشـکەوتووەو چەقبەستوو، نەریتی یەکە بە دیوارێکدا چەند بنیادنەربێ بـە دیوەکـەی دیدا وێرانکەرە.

رۆشنبیرنەبوون لەسەر ڕەخنەو بە هەرەمـەکی چـوونە نـاوی، دەبێتـە هۆی کەمبوونی نەمانی ئەخلاقی ڕەخنەیی‌و، هەر کەسـێك بـە کـەیفی خۆی لە هەر کەناڵێکی پەخش‌و چاپەوە لە ژێر ناوی ئازادی چەند پرسی چارەنووسسازو کەسیەتی هەڵکەوتـە دەداتـە بـەر زمـانی خـۆی‌و نـاوی ڕەخنەی لێدەنێ.

زڕاندنی ناوی کەسی دەزگاو دامەزراوو هەتا ڕۆچوونە ناو ژیانی تایبەتی کەس دانە پاڵی تۆمەتو قسەی نابەجێ.

زمان یەکێکە لە گرنگترین کەرستە لە کەرستەکانی دروستبوونی ڕەخنەو، بە هەموو زمانێك ناتوانرێ ڕەخنە بگیرێ، ئەگەر زمانێك نەکاتە قۆناغێکی پێشکەوتوو شارەزاو تۆکمە، چۆن دەتوانرێ وەڵامیشی پێ بێ چارەسەری تێکەڵ کردنی زمانی پیسو زمانی زبرو زمانی سواوو زمانی ستایشو وێکڕا لە بابەتێکدا بە ناوی ڕەخنەو وەشاندنیشی دەکاربردنی، زمانێك نە سیاسیەکانی پێ نیگەران بنو نە نووسەرەکانو نە هاوڵاتیانی ئاسایی لێی دڵگران بن، یان پەیامێك بە زمانی زبر بۆ نوسەران دەنووسرێو سیاسییەکان وەبەر زمانێکی پیس دەدا بە زمانێکی کوولو کۆن یان ستایش پێکراویش ئاراستەی هاوڵاتیان دەکا.

نەبوونی ڕەخنە چەندە ترسناكو کوشندەیە، دروست بوونو ڕەگ داکوتانی ئەو دیاردەی ڕەخنەیە، دەهێندە کوشندەترو مەترسیدارترە.

تێکەڵ کردنی پێوەرو زمانو ڕووداو ئاڕاستەیەکی دی ئەو پرسەیە، کاتێك بکەرەکانی کە لەسەر (ڕەخنەیەکی مەتاتی ) (لاستیکی) کاردەکەن چەند بەرژەوەندیان بڕوا ئەوەندە پلاستیکەکە دەکێشن، چەند ڕووداو باوبن لەسەر ئەوان ڕادەوەستنو دەنووسنو، چ زمانێك بە بەرژەوەندیان بێ بەو دەنووسنو بەو پێوانەش کاریان پێ دەڕوا، هەموو پرسیارێك دەخەنە ژێر پرسیارو شیکردنەوەو ڕەخنەلێگرتنی نە لەبۆ پرسەکانی ڕابردوو ئاوڕ دەدەنەوە نە پرسەکانی داهاتووش دەخوێننەوە.

میللـەتانی دواکـەوتوو هەمیشـە پشـت بـە (ڕەخنـەی لاسـتیکی) دەبەستن‌و وەکو سەرچاوە دەگەڕێنەوە سەری‌و دەیکەنە گەواهی.

نەبوونی ڕەخنـەی سیاسـی بـە تـەنها قـەیرانێکی سیاسـی دروسـت ناکات‌و، بەڵکو گەورەترین قەیرانێکی ئەخلاقی گەورەشی لەپاشە بۆ ئەو گەلانە نەوە لە دوای نەوەیان.

نووسەرەکانیان دەم‌و دەست زمان‌و چاو بۆ هـەموو کەسـێك دەکـوتن، خۆ لە هەموو پرسێك هەڵدەقولێتێنن " لە ژێر نـاوی ڕۆشـنبیردا هـەموو بەرگێك دەپۆشن‌و هەتا دەگەنە لقێکـی دەسـەڵاتی سیاسـی‌و وەرگـرتنی پۆسـت لـەناو دەزگـا ڕۆشـنبیریی‌و ڕاگەیانـدنیان‌و وەشـانەکانیان بـە بـەراوەژوویی جـاڕی ڕەخنـەی ئـازادو ڕەخنـەی سیاسـیی‌و مەدەنیـەت‌و دیموکراسیەت بۆ دەسەڵات لێدەدەن.

ڕەخنەی سیاسی پەیوەند ییەکی تێکهەلکێشی هەیە دەگەڵ هۆشیاری سیاسی‌و دەبێتە هۆی دروستبوون‌و ڕسـکانی ئـەخلاقی سیاسـی ، چـۆن ڕەخنە دەبێ هەموو بنەماو ڕەگەزو پێوەرێکی تێدا هاوسەنگ بێـت. بـۆ نموونە: سیاسییەك ببێتـە سـەرمایەدارێکی گـەورە بـەبێ دیـار بـوونی سەرچاوەی باگراوندی سەرمایەکەی ؟

میللەتانی پێشکەوتوو بیرمەندی بەسوودیان لە ناو هەڵکەوتووە، کە هەنگاو بە هەنگاو بڕیار بە بڕیاری سیاسەتی خۆ دەدەنە بـەر تێفکـرین‌و شی کردنەوەو بەراوردکردنی دەگـەڵ ئاسـتی هۆشـیاری کۆمەڵگـەکان‌و گلۆبـالیزم‌و پێشـکەوتنە تەکنەلۆژیـەکان بـەراوردی دەکـەن، کەسـانی

بێویژدان‌و لەبۆ هەموو تاوانكاریەكیان سیاسی بوونی خۆیان دەكەنە دروشم‌و دەبنە هۆی ڕەگ داكوتانی بێ ئەخلاقی سیاسی .

مێژووی میللەتانی دواكەوتوو پڕە لەو ئەزموونانەو، تەنها بەهەڕەمەكی وەنێو سیاسەت كەوتوون‌و بە هەڕەمەكی سیاسەتی خۆ پیادە دەكەن، بەبێ پلان ڕووداوە سیاسییەكان بەسەریاندا تێدەپەڕن‌و، بەبێ پلان هەنگاوی سیاسی هەڵدەنێنن، كولتووری سیاسییان هێندە تەم‌و مژاوی‌و داپۆشراوە، كە پاش تێپەڕبوونی نیو سەدەش كەس ناگاتە ڕاستی ڕووداوو تەنگژەو مێژووە سیاسیەكان!

# شەڕ یا ئەودیوی دڵی من

لەدەسپێکێ دەمەوێ وێکڕا هەموو ژ دڵی خۆمان ڕامێنینو بۆنی دڵی خۆمان بکەین، لەبۆ ئەوەی بزانین شەڕ چەوا ڕەنگو بۆنو نەخشەی دڵەکانی شێواندوین، بەتەنها لەبەر ئەوەی کوردین! هەروەها دەبێ بزانین لەهەر کوێیەکی دنیایە بین دڵمان هەڵوەریوەو وشك هەڵاتوەو دڵمان بەسوێیە بەهیچ ناکرێتەوەو چۆن تا ئێستا خودان وڵات نین هەر ئەوهاش خودان دڵی خۆمان نین!

شەڕ یا ئەودیوی دڵی من کۆکردنەوەی دڵی ئەوان ژنانەیە کە شەڕ دڵی لەبەربردون، شەڕ وا ڕۆچۆتە خوێنیانەوە حەوت پشتی گرتۆنەتەوە دەگەڵ هەر منداڵ بەزگ کەوتنێكو منداڵبوونێکیان شەڕێك سەری هەڵداوەو هەڵایساوەتەوە، ژنەکان لەپاش مردنیشیان کە دووبارە دەگەڕێنەوە ناو ژیان دەبینن شەڕێکی دی لەئارادایە.

ئەڤ ئێوارەیەی لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەم لە کاروانی ئەو پێشمەرگانە ڕامابووم، کە لە کەرکوك گەڕێنرانەوەو ڕێگەیان پێنەدرا بچنە ناو کەرکوکێ، پاش شەڕی عێراقو پاش سێ مانگان سوپای ئەمەریکی کەوتە چەککردنی هەموو هێزی پێشمەرگەکان، تەزوویەکی ساردو مێژوویەکی دووبارە بووەوە رایچڵەکاندم، کەوتمە خەیاڵی ئەڤ نووسینەی،

هەروەها ئەو بەیانییەی ئاپۆرای ئەو هەموو ژنە ڕەشپۆشانەم دیتن لە چاوەڕوانی ترۆمبێلان دابوون تا بچن ئێسقانی خۆشەویستە ئەنفالکراوەکانیان بهێننەوەو ئەو پۆلە دیلانەی لەناوەڕاستی شاری رانیەدا گوللەبارانکرانو تەرمەکانیان ئاوردان لە شەڕی براکوژی پشدەرێداو ئەو پۆلە کیژە گەریلایانەی لە حاجی ئۆمەرانێ پاش بەدیل کوشتنیان لە ترومبێلان خرانو کەس نەبوو تەرمەکانیشیان بشوا.

شەڕ یا ئەو دیوی دڵی من، بەرچنێکە لە دڵی ئەو ژنانەی بەعەشقەوە دڵیان لە شەڕو دڵیان لە خۆشەویستییەدا لەبەرچووەو لە شەڕگەکانی ئازادیدا کوێربوونەوەو لەبەریەك هەڵوەشاون، هەروەها بۆنی دڵی ئەو ژنە کوردە رەسەنانەیە کە هەموو دەمێ ژیان لەچاوانیاندا دێو دەچێو خۆپارێزن لەو بازرگانییەی ئەورۆ بەناوو بە مافیانەوە دەکرێو لەهەر کوێیەکی دنیایە بن دەست بەرەنگو دەست بەدڵی خۆوە دەگرن.

شەڕ یا ئەو دیوی دڵی من، ئەودیوی دڵی هەموو ئەڤ ژنانەیە، کە سی ساڵی بەرێیان تێپەڕاندووە بە گوزەراندن بەنێو سێ شەڕی براکوژی، ئەویش براکوژی هەکاریو براکوژی پشتئاشانێو براکوژی پشدەرێ بوونە، ڤێ دەمێ ژنان قوربانی گەورەی براکوژی بوون وەکو دایكو خوشكو ژنو کیژو خۆشەویست، تووشی گەورەترین مەینەتباریو کەساسی بوون.

شەڕ یا ئەو دیوی دڵی من، ئەو دیوی دڵی تەواوی ئەڤ ژنانەیە، کە کارەساتەکانی ئەنفالو راگواستنو هەڵەبجە قڕکردنی رەگەزی ئەوکی گرتونو دڵی جوانیانی هەلا بە هەلا کردوە، ئەودیوی چاوی ئەوان ژنە نازدارانەی بە پاشماوەی ئەنفالێیان ناوزەد کردوونە چاوەکانیان رۆژێ

بازرگانیان پێ دەکرێن‌و ئەڤ دیوی دڵی هەموو ئەو هەموو ژنە پەکەوتوو ژنە شەنگ‌و کەسك‌و سورانەیە کە مانگانە لەبەردەم دەزگایەکان لە ریزی مووچەی شەهیدانەکانیان دڵی ناسکیان هەڵدەقرچێ‌و سەد جار دەشکێ.

شەڕ یا ئەودیوی دڵی ئەوان هەموو کوردانەیە، کە راوەدونان‌و برسییەتی‌و ماڵوێرانی تەنگی پێ هەڵچنین‌و بە قاچاخ‌و بە لافاو وەڕێکەوتن‌و بوونە پەنابەر لە تاراوگە، لە تاراوگەش لە بێکەسی‌و بێ ڕەوەندی رۆژەك دەکوژرێن‌و رۆژەك دەکەونە ژێر هەڕەشەی ناردنەوە، تا دڵیان وەك بێژنگ کون کون بووەو هیچ خۆی پێوە ڕاناگرێ.

هەروەها داڵغەیەکی قووڵە لەبۆ هەموو ئەو شەڕە بێناوانەی دێنە سەر ڕێگای ژنان وەکو شەڕی خۆشەویستی‌و شەڕی ئازادی‌و شەڕی لەشفرۆشی ئێخەیان دەگرێ‌و گەلەك بەغەریبی تێیاندا دەبنە قوربانی‌و بەکوشت دەدرێن.

شەڕ یا ئەودیوی دڵی من هەموو ئەو شەڕە وردو درشتانەیە کە ئێستای ژیانی کوردیان داپۆشیوە، شەڕێکە بێ تەقاندنی فیشەك‌و بێ لەشکرکێشی سەربازی دوژمنانی گەورەی کورد پلانی بۆ ڕێك دەخەن، بەتایبەت لەناوچەکانی شێخان‌و گەرمیانێ، لەبۆیە ئەو شەڕی ئێستا بە کۆڕەوێك دەچوێنێ تێیدا هەموو بەهاو پیرۆزی‌و جوانی‌و کولتووری راستەقینەی کوردی خستۆتە کۆڕەوێکەوەو کەس نازانێ لەبۆ کوێ‌و چۆن دەڕواو تێدەپەڕێ.

لەو دیوی ئەو شەڕە کوشندەیەی ئێستا ڕادەمـێنێ کـە شـەڕێکە بـێ ڕەنگو بێ ناوو بێ بۆن سەرەتاتکێن دەگـەڵ دەکـا بـۆ ئـەنفالکردنێکی نوێو هەڵەبجەیەکی نوێو لەبـەر هەڵتەکاندنەوەیـەکی نـوێ، شـەڕێکە زمانو سروشتو ڕەسانایەتی نەتەوەیەك لەبەین دەبا.

لەبۆیە ئەز گەلەك دڵنیام کە بەسەدان ورتکە شـەڕو شـەڕی بێنـاوو شەڕی سواغ دراوو شەڕی دەقووتوکراو شەڕی ئـازادی لەسەرنووسـراو بـۆ سەر نەتەوەی کورد بەڕێوەن، بەتایبەت ئەو هەموو شەڕ چـێنراوانەی بـۆ سەر زمانو ئەقڵی ژنان هێرش دێننو ڕووی جوانیان بەهەتکراوی بە دنیا دەناسێنن، بەبیانوی ئازادکردنی جەستەیان بەکوشتیان دەدەن.

ئومێدێ دەکەم لەگـەڵ خۆشەویسـتی کوردسـتان بتـوانم ئەگـەر بـە هەوڵێکی گچکەلەش بێت ناوو مێژووی دزێوی ئەو شەڕانە بهێنمـە نێـو ئەدەبی کـوردیو ڕووی هـەڵکروزاوی ژن لـەوان شـەڕاندا وێنـە بکـەمو ناوچاوی بەفرمێسكو پرۆشەبوویان بنووسمەوە، دەگەڵ ئەوەی دڵنیام ئەڤرۆ شـەڕێك ئێخـەی گرتـووینو شـەڕێك چـاوەکانی بەسـتوین، شـەڕێکە ئێسقانەکانمان دەهاڕێ لەبن دروشمی دیموکراسی هەپڕون بەهەپڕون دەکـا بەناوی مەدەنیەتو زمانمان دەردەکێشی بـە تـەویای سـەربەخۆیەو ڕۆژێ لەچـوار دەورەمـانڕا بـە پـۆل لەشـکر دەکشـێنە نـاو خاکمـانو سەربازەکانیشیان بەپێش چاومانەوە دڵی ئێمەیان وەکـی پۆسـتاڵەکانیان لەپێ کـردوەو بەنـەزانن ناوزەدەکـەنو ڕۆژێ لەلایـەکی ڕا بـە خـواردنێ ژاراوین دەکەن لەلایەکی دی ڕا بەئاوێ دا ڤایرۆسن بۆ دەنێرن.

له دوماهییەدا دنیایەك خۆشەویستیم بۆ هەركەسێك تاو دەداتە ئـەو كتێبەو بە دڵ دەیخوێنێتەوەو بەدڵ تێی ڕادەمێنیٚ، دڵی هەموو ئەوانـەش ماچ دەكەم كە یەك لەوان شـەڕە نەگریسـانە دڵـی تووشـی شـكاندنیٚو ڕەنجاندنیٚو هەڵتەكانیٚ كردوونو دڵیان خوێنی لەبەر دەڕواو دڵ بریندارن.

- شەڕ یا ئەو دیووی دڵی من لە سالی ٢٠٠٦ لەدەزگای ئاراس چاپكراوە
War or behind my heart

# هەڵپاچینی یاساییەکان

لەبەرایەدا حەزدەکەم سەرنجتان ڕابکیشمە سەر پێگەوە جێگەی ئێستای ژنی کورد

لە کۆمەڵگای کوردی دا لەپاشان تایبەتمەندی ئەو یاسایە بەژیانی کۆمەلایەتی یەوە رەگھاویشتنی بۆ ناو وردەکاریەکانی ژیانی ژن.

ئەز هەست بە ئازارێکی گەلێك قول دەکەم ئەو دەمانەی لە پێگەی ژن لە کۆمەڵگەی کوردی دا دەفکرم چونکە هەموومان لێمان ڕوونە کە ئێمە نەتەوەیەکین تا ئێستای دەگەڵ دابێت خودان پێگەو پەیامێکی نەتەوەیی نین لە دنیایەدا هەر ڕۆ ژەی لەسەر دەستی نەتەوەك دێتە هەراج کردنو مامەڵی پێکردنێ، جا وەرە نەتەوەیەك لەو ئاستەدابێتو ژنیش بە پلە دوو بێت لەناو ژیانی کۆمەڵیەتیەیدا ئەوە دەبێت چ کارەساتێك بێت؟ ژنێك کە خودان هیچ پێگەیەکی سیاسیو ئابووری پتەو بێتو دەرەوەی ئالوگۆڕییەکانی ئەو بازنەیەدا بێتو نازانم ج کاریگەریەکی لەسەر گۆڕینی یاسا دەبێتو بە چ هێزێك یاسا دەبزێوێ ئەز پێشتریش ئاماژەم بەوە داوە کە ژن لەتەواوی ژیانی کۆمەکایەتیدا داشۆراوە بێ لەو ریژەیەی لەسوچێکی ژیانی ئیداریدا ئەرکەکانی دووبارە دەکاتەوە.

لە بۆیە ئەز بەدڵنیایەوە دەبێژم لەسەدا نەوەدی ژن لە کۆمەڵگای ئێمەدا هیچ هۆشیارییەکی یاسایی نییەو تا ئێستا ئاگاداری هیچ جۆرە ماف‌و ئەرکێکی خۆی نییەو بە هەڕەمەکی بەناو ژیاندا رێدەکا، خاڵێکی تر هەیە، من زۆرم پێ گرنگەو جێی تێڕامانیێشە کە ژن لە کۆمەڵگەی ئێمەدا زۆر بە شەرم‌و نەنگی دەزانێ کارو کێشەی بکەوێتە دادگاو بەردەستی دادوەرو پارێزەران، بۆیە هەتا پێیدەکرێ کێشەکانی حەشاردەدات‌و یا بەسەریاندا بازدەدات بەو مانایەی تێڕوانینی ژن بۆ یاسا تا ئەوڕۆکە بەدوو ئاراستاندا دەخزێ، ئەویش یەکیان ترسەو یەکیان شەرمە، لەبۆیە بەکورتی دوورەپەرێزی ژنان لە یاسا بەهەڵەو خەتەرێکی گەورە دەزانم.

ئەوجار بگەڕێمەوە سەر پەسەندکردنی پڕۆژە یاسای باری کەسی بەتایبەت ئەو مادەیەی کە فرەژنی رێ پێدەدات بۆ من جێی سەرسوڕمانێ نەبوو، چونکە دڵنیام دۆخی ژیانی ژن هێندە شەپڕێوو هەلاهەلابووە لەو قۆناغەدا بە گۆڕینی دەیان یاساش چارەناکرێ، فرەژنی کە بە یاسا پێناسەکراوە لێ داشۆرانی ژن لە کەسایەتی سەربەخۆی خۆی، خۆ لەبیرکردن‌و ملنان بەرەو بە کالابوونی زۆر زۆر لە فرەژنی خەتەرترە! لەبۆیە ئێستێ ژن ژیانی لە لەقۆناغێکدایە هەر رۆژەی چەندین ژن لێرەو لەوێ بە بەهانەی جوداجودا دەکوژرێن، چاوەڕێش بکەین یاسایەکی زۆر لەبار لە بەرژەنەوەندی پەسەند بکرێ؟ چما هەموومان نازانین ژن کوشتن بە چ مانایەك دێ؟ لەبۆیە لە کۆمەڵگەیەکدا سیستەمی یاسای پڕ لەکون‌و کەلەبەرو خەوش بێت،

گۆڕینی یاسا بە چ مانایەك دێت؟ هەروەها دەبێ دڵنیابین ئەگەر گرووپە ئیسلامییەکان ئەورۆ خودان ئەو پێگەیەن، کە کاریگەریان لەسەر بڕیارێکی وەها تایبەت بە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە هەبێت، دیارە پتریش دەستیان دەڕواو چۆنیان بوێ هاوکێشەکان وا دەگۆڕن لێرەو بەدوا. هەروەها زۆربەی بەناو عەلمانییەکان بەهەمان ئاراستە لە مافەکانی ژن دەڕوانن، لێ بە بەرگو ناوی جوداجودا.

بۆ چاوپێداخشاندنەوەی ئەو یاسایە پێویستن بەخەباتو ڕێکخستنی زۆر لە ڕێکخراوو دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیو کەسایەتی شارەزاو ڕۆشنبیران هەیە، لێ دووبارە دەیڵێمەوە خۆ ئەستەمە ڕێکخراوەکانی ژنانو کۆمەڵگەی مەدەنی بتوانن هیچ کاریگەریەکی ئەوتۆیان هەبێ هەر لەسەر ئەو بابەتە نا، بەڵکو لەسەر زۆر کێشەو گرفتی تر، چونکە قەت پێموانیە هیچ ڕێکخراوێکی ژنان بتوانێ دوو هەزار ژن بە ڕێکوپێکی یەك ڕۆژ بێنێتە سەر شەقاماکانو مانیان پێ بگرێو پێیان پێداگرێ لەسەر سوربوون لەسەر داواکانیان، لێ لەوانیە ڕێخراوێکی حیزبی یا مەلایەك بتوانێ ئەوە بەئاسانی بکا لەو چوارچێوەیەی بۆی دیاری دەکرێو ڕێی پێدەدرێ!

لەبۆیە ئەز ئومێد دەکەم ژن فێری خەبات کردن بێت ژن بۆ خۆ سور بێت لەسەر گەڕانەوەی کەسایەتی بۆخۆی وەکو مرۆڤ، ژن خۆ بینا بکاتەوەو خۆ ڕزگارکا هەر لەدەستی پیاوان نا، بەڵکو لەدەستی ئەو ژنە بە ڕۆبۆت بووانەی ڕۆژێ خۆ ئارایشت دەدەنو لەسەر شاشەی تیڤیەکان بازرگانی بە خوێنو ناوی ژنی کوردی بەستەزمانەوە دەکەن، ڕۆژێك

دوكـانی یاسـا گـۆڕێن‌و دێنـه گـۆڕێ‌و ڕۆژەك دوكـانی كۆمیتـەی دژی ژنكوژی كاسبـی پێوە دەكەن.

له دوماهیەدا دەبێژم هەردەم ژن توانی ژیانێكی شەرەفمەندانه بۆ خۆ بگەڕێنێتەوە، ئەودەم سەردەكەوێ‌و دەتوانێ یاسـایەكان لـە بەرژەوەنـدی خۆی بگۆڕێ‌و ڕووی بە گۆڕانكاری‌و پێسكەوتنەكانی كۆمەڵگەی خۆیەوە هەبێت.

# ناوەرۆك